# مزگینییا یوحەنای

انجيل يوحنا - كردي «بهدیناني»

İNCİL'İN YUHANNA BÖLÜMÜ
(Kürtçe - Behdineni)

الجمعية الدولية للكتاب المقدس

(کۆمەلا دەولی یا کتێبا پیرۆز)

KİTABI MUKADDES ŞİRKETİ
Rıza Paşa Yokuşu 50/D
Eminönü - İstanbul

ISBN 975-462-043-1



Baskı: Anadolu Ofset - İstanbul
Tel.: (0212) 567 13 89
Eylül - 2000

# ئاگەهداری:

ل گەلەک جهـا د ئنجـيـلا پيـرۆزدا، بەحـسێ عـيسـاى يێ هاتـىيە كرن كو كورێ خودێ يە، يان ژى ب ڤێ چەندێ يێ هـاتـىيە ناڤكرن. هيـــڤىيە خــەلەت تێ نە گــەهن. چونكو مـەبەست نە كـورێ لەشى يە، بەلێ مـەبەست ئەوە كـورێ ڕوحى يە. يان ژى مـەبەست ئەوە يێ ژ روحا خودێ دەركەفتى وچێبووى. هندى خـودێ يە، پێتـڤى ب چو ژن وكـوڕا نينە وەكـو مە مروڤا ژ خوين وگوشتى.

# «مزگینی‌یا یوحەننای»

## پشکا ئێکێ (١)

**مەسیح پەیڤا خودێ:**

[١] ل دەستپێکێ پەیڤ بوو، و پەیڤ ل گەل خودێ بوو، و پەیڤ ب خۆ خودێ بوو. [٢]ئەو ل دەستپێکێ ل گەل خودێ بوو. [٣]ب وی هەمی تشتێت چێبووین، و بێ وی چو تشت نەچێبوویە ژ ئەڤێت چێبووین. [٤]و ژیان د وی‌دا بوو، و ئەڤ ژیانە رۆناهی بوو بۆ مرۆڤا. [٥]و رۆناهی د تاریێ‌دا ئاشکرا دبیت، و تاری د رۆناهیێ نەگەهشت.

[٦]مرۆڤەک دیار بوو خودێ هنارت بوو، ناڤێ وی یوحەننا بوو. [٧]هات دا شەهدەکیێ بۆ رۆناهیێ بدەت، دا هەمی ب رێ‌یا وی باوەریێ بینن. [٨]ئەو نە رۆناهی بوو، بەلێ شاهد بوو بۆ رۆناهیێ.

[٩]رۆناهی‌یا راست یا هەمی مرۆڤا رۆن دکەت دهاتە دونیایێ. [١٠]ئەو ل دونیایێ بوو، ب وی دونیا یا

چێبووی، و دونیایێ ئەو نەنیاسی. [١١] ئەو بۆ خەلکێ خۆ هاتبوو، بەلێ وان پشتا خۆ دایێ، [١٢] بەلێ ئەڤێت پێ رازی بووین، ئانکو باوەری ب ناڤێ وی ئینایین، ماف دا وان ببنە بچویکێت خودێ [١٣] ئەوێت نە ژ خوینێ و نە ژ ڤیانا لەشی و نە ژ ڤیانا مرۆڤەکی بووین، بەلێ ئەوێت ژ خودێ بووین.

[١٤] و پەیڤ بوو لەش، و دناڤ مەدا دانا، و مە مەزناهییا وی دیت، مەزناهییا کورێ ئێکانە ل نک بابی، و ئەو یێ تژییە ژ چاکییێ و راستییێ. [١٥] یوحەننای بۆ وی شەهدەکی دا و کرە گازی و گۆت: «ئەڤەیە ئەڤێ من دەربارەی وی گۆتی: ئەوێ پشتی من دئێت یێ د سەر منرایە، چونکو ئەو هەبوو ژ بەری ئەز پەیدا ببم.» [١٦] و ژ تژیبوونا وی مە هەمییا چاکی ل سەر چاکییێ وەرگرت، [١٧] چونکو دەستور ب دەستێ موسای هاتبوو دان، بەلێ چاکی و راستی ب عیسایێ مەسیح پەیدا بوون. [١٨] کەسی چو جارا خودێ نە دیتییە، بەلێ کورێ ئێکانە ئەوێ د کۆشا بابیدا ئەوی ب تنێ یێ ئاشکرا کری.

**شەهدەکییا یوحەننایێ ژێراڤکەر:**

[١٩] و ئەڤە شەهدەکییا یوحەننایە دەمێ جوهییا هندەک

قەشە و لاوی ژ ئورشەلیمێ هنارتینە نک دا ژێ بپرسن: «تو کی؟» [٢٠] دان کر و نەوەیی نەکر و دووبارە کر و گۆت: «ئەز نە مەسیحم.» [٢١] ژێ پرسین: «پا چ؟ تو ئێلیای؟» گۆتی: «ئەز نە ئەوم!» «یان تو پێغەمبەری؟» بەرسڤ دا: «نەخێر!» [٢٢] گۆتنێ: «تو کی، دا بەرسڤێ بدەینە وان ئەوێت ئەم هنارتین؟ تو چ ل سەر خۆ دبێژی؟» [٢٣] گۆتی: «ئەزم **دەنگەک ل بیابانێ دکەت گازی و هاوار: رێکێ راست بکەن بەرامبەر خودانی،**[ئەشعیا ٤٠:٣] هەروەکو ئەشعیا پێغەمبەر گۆتی.» [٢٤] و ئەڤە دهنارتی بوون ژ لایێ فەریسیياڤە، [٢٥] و جارەکا دی ژێ پرسین: «هەکەر تو نە مەسیح بی، و نە ئێلیا بی، و نە پێغەمبەر بی، پا تو بۆچی ژێراڤکرنێ دکەی؟» [٢٦] یوحەننای بەرسڤ دا: «ئەز ب ئاڤێ ژێراڤکرنێ دکەم، بەلێ ئێک یێ دناڤ هەوەدا هوین نانیاسن، [٢٧] و ئەو یێ ل پشت من دئێت، و ئەز نە یێ هەژیمە بەندکێت پێلاڤا وی ڤەکەم.» [٢٨] ئەڤێ ل بێت عەنیا روی دا، ل پشت رویبارێ ئوردنێ، ل جهێ یوحەننای ژێرئاڤکرن دکر.

[٢٩] و ل رۆژا دویڤدا یوحەننای دیت عیسا یێ بەرەڤ وی‌ڤە دئێت، و گۆت: «ئەڤەیە بەرخێ خودێ ئەوێ گونەها دونیایێ رادکەت. [٣٠] ئەڤەیە ئەوێ من ل سەر گۆتی: ئەو زەلامێ ل پشت من دئێت یێ د سەر من‌رایە چونکو

بەری ئەز پەیدا ببم ئەو هەبوو. [٣١] و من ئەو نەدنیاسی بەلێ ئەز هاتم ب ئاڤێ ژێرئاڤکرنێ بکەم دا بۆ ئیسرائیلێ بێتە راگەهاندن.» [٣٢] و یوحەننای شەهدەکی دا و گۆت: «من روح دیت ب رەنگێ کۆترەکێ دادا سەر وی [٣٣] و من ئەو نەدنیاسی، بەلێ ئەڤێ ئەز هنارتیم ب ئاڤێ ژێرئاڤکرنێ بکەم گۆتە من: «ئەوێ تو دبینی روح ل سەر داددەت و لێ ڤەدحەویێت ئەو دێ ب روحا پیرۆز ژێرئاڤکرنێ کەت.» [٣٤] و من ئەڤ چەندە دیت، من شەهدەکی دا کو ئەو کورێ خودێ یە.»

## دەستپێکێ ئێکێ ژ شاگردا:

[٣٥] و ل رۆژا دویڤ دا یوحەننا ژی یێ راوەستای بوو و دوو شاگردێت وی ل گەل بوون، [٣٦] سەح کرە عیسای دەمێ ب رێڤە دچۆ و گۆت: «ئەڤەیە بەرخێ خودێ.» [٣٧] دەمێ هەردوو شاگردا گوه ل ئاخفتنا وی بووی ل دویڤ عیسای چۆن. [٣٨] عیسا ل خۆ زڤری، دیت کو ئەو یێت ل دویڤ وی دچن، ژ وان پرسی: «هەوە چ دڤێت؟» گۆتن: «رابی،» ئانکو مامۆستا، «تو ل کیرێ یێ ئاکنجی؟» [٣٩] بەرسڤا وان دا: «وەرن و بنێرن.» و ل گەل چۆن و جهێ وی دیت و وێ رۆژێ ل گەل مان، و دەم نێزیکی دەمژمێرا دەهێ بوو ژ رۆژێ. [٤٠] و ئەندراوس برایێ

شەمعون پەتروسی ئێک ژ وان هەردووکا بوو ئەوێت ل دویڤ عیسای چۆین پشتی گوهـ ل ئاخفتنێت یوحەننای بووی. [٤١] دەمێ برایێ خۆ شەمعون دیتی، گۆتێ: «مە مەسیح دیت،» ئانکو: یێ روونکری، [٤٢] و برە نک عیسای. و عیسا باش ل شەمعونی نێری و گۆت: «تو شەمعونێ کورێ یوحەننایی، بەلێ ئەز دێ تە ب کیفاس ناڤ کەم ئانکو پەتروس.»

[٤٣] و ل رۆژا دویڤ دا عیسای ل بەر بوو بچیتە دەڤەرا جەلیل، فیلیپس دیت و گۆتێ: «ل دویڤ من وەرە!» [٤٤] و فیلیپس ژ بێت سەیدا بوو بازێرێ ئەندراوسی و پەتروسی. [٤٥] پاشی فیلیپسی نەتانائێل دیت، و گۆتێ: «مە ئەو دیت ئەوێ موسای د دەستووریدا ل سەر نڤێسای و پێغەمبەرا د پەرتوکێت خۆدا، ئەو ژی عیسایێ کورێ یوسڤییە، خەلکێ ناسیرەیە.» [٤٦] نەتانائێلی گۆت: «ما تشتەکێ باش ژ ناسیرە دەردکەڤیت؟» فیلیپسی بەرسڤا وی دا: «وەرە و بنێرە!» [٤٧] و عیسای نەتانائێل دیت یێ بەرەڤ ویڤە دئێت و ل سەر وی گۆت: «ئەڤە ئیسرائیلییەکێ راستە، چو گومان تێدا نینە!» [٤٨] نەتانائێل ژێ پرسی: «تو ژ کیڤە من دنیاسی؟» عیسای بەرسڤا وی دا: «من تو ل بن دارا هژیرێ دیتی بەری فیلیپس گازی تە بکەت.» [٤٩] و نەتانائێلی کرە

گازی و گۆت: «رابی، تو کوڕێ خودێ‌یی، تو پاشایێ ئیسرائیلێ‌یی!» [٥٠] عیسای گۆته وی: «چونکو من گۆته ته من تو ل بن هژیرێ دیتی ته باوەری ئینا، دێ ژ ڤێ مەزنتر بینی.» [٥١] و پاشی گۆتێ: «ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە هوین دێ ئەسمانی بینن یێ ڤەکری‌یە و فریشتێت خودێ یێ بلند دبن و دئێنە خوار ل سەر کوڕێ مرۆڤ!»

## پشکا دووێ (٢)

### سەرسوڕمانا عیسای یا ئێکێ:

[١] ل رۆژا سێیێ دەهواتەک ل قانا هەبوو ل دەڤەرا جەلیل، دایکا عیسای ل وێرێ بوو، [٢] و عیسا و شاگردێت وی ژی هاتبوونە داخوازکرن بۆ دەهواتێ. [٣] دەمێ مەی نەمای، دایکا عیسای گۆتە وی: «مەی ل نک وان نەمایە.» [٤] بەرسڤا وێ دا: «تە چ ژ منە دایێ! دەمێ من هێشتا نەهاتی‌یە.» [٥] دایکا وی گۆتە خزمەتکارا: «چ فەرمانا ددەتە هەوە، پێ بکەن.» [٦] و شەش حەودێت بەری ل وێرێ بوون، جوهیا ئاڤا وان ب کار دئینا بۆ تافیرکرنێ، هەر ئێک ژ وانا دوو هەتا سێ جەرکێت ئاڤێ دچۆیێ. [٧] عیسای گۆتە خزمەتکارا:

«حەودا تژی ئاڤ بکەن.» و هندکرنێ دا د سەردا چت. [٨] و گۆتە وان: «و نۆکە ژێ داگرن و بۆ سەرۆکێ نانخوارنێ پێشکێش کەن.» و وان وە کر. [٩] دەمێ سەرۆکێ نانخوارنێ تام کری‌یە وێ ئاڤا بوویە مەی و سەرچاوێ وێ نەدزانی، بەلێ ئەو خزمەتکارێت پێشکێش دکرن دزانی، گازی زاڤای کر [١٠] و گۆتە وی: «خەلک هەمی مەیا باش ل بەراهیێ پێشکێش دکەن، و پشتی مێهڤان سەرخۆش دبن مەیەکا کێمتر ژ وێ پێشکێش دکەن، بەلێ تە مەیا باش یا هێلای تا نۆکە!» [١١] ئەڤ سەرسورمانە نیشانا ئێکێ‌یە ئەوا عیسا ل قانا کری ل جەلیل و مەزناهی‌یا خۆ دیار کر و شاگردێت وی باوەری پێ ئینا. [١٢] پشتی ڤێ چەندێ عیسا و دایکا خۆ و برایێت خۆ و شاگردێت خۆ چۆنە باژێرێ کەفەرناحومێ و چەند رۆژەکا ل وێرێ مان.

## عیسا د پەرستگەهێ‌دا:

[١٣] دەمێ جەژنا دەربازبوونا جوهیا نێزیک بووی عیسا بەرەڤ ئورشەلیمێ چۆ. [١٤] و ئەوی ل پەرستگەهێ فرۆشکارێت چێلا و پەزی و کۆترا و پارەگهۆر یێت روینشتی ل پشت مێزێت خۆ دیتن، [١٥] قامچیەک ژ کنفا ڤەهاند و هەمی ژ پەرستگەهێ کرنە دەرێ ل گەل پەز و

چێلا، و مێزێت پارەگهۆڕا ب سەرئێک دا ئینانە خوار و پارێت وان بژاله کرن، [١٦] و گۆتە کۆترفرۆشا: «ئەڤا ژ ڤێرێ بکەنە دەرێ، مالا بابێ من نەکەنە مالا بازرگانییێ!» [١٧] و هاتە بیرا شاگردێت وی کو یا د پەرتوکێ‌دا هاتی: **حەزێکرنا من ل سەر مالا تە من دخۆت.** [زەبور ٦٩:٩]

[١٨] جوهی بەرهنگاری عیسای بوون و گۆتنێ: «نیشانەکێ بینە دەستهەلاتی‌یا تە دیار بکەت بۆ ڤی کارێ تە کری.» [١٩] عیسای بەرسڤا وان دا: «ئەڤێ پەرستگەهێ بهەرفینن، و دێ د سێ رۆژادا ئاڤا کەم.» [٢٠] جوهییا گۆتە وی: «ئاڤاکرنا ڤێ پەرستگەهێ چل و شەش سالا یا ڤەکێشای. ئەرێ تو دێ د سێ رۆژادا ئاڤا کەی؟» [٢١] لێ ئەوی بەحسا پەرستگەهێ لەشێ خۆ دکر. [٢٢] دەمێ ل ناڤ مرییا رابووی هاتە بیرا شاگردێت وی ئەڤ ئاخفتنا وی و باوەری ب پەرتوکێ و ئاخفتنا عیسای گۆتی ئینا.

[٢٣] و دەمێ ئەو ل ئورشەلیمێ ل جەژنا دەربازبوونێ گەلەکا باوەری ب ناڤێ وی ئینا چونکو وان ئەو نیشانێت کرین دیتن. [٢٤] بەلێ عیسا ژ وان نەی پشت راست بوو چونکو وی هەمی دنیاسین [٢٥] و پێتڤی نەبوو ئێک بۆ وی شەهدەکێ بدەت دەربارەی مرۆڤی چونکو ئەو یا د دلێ مرۆڤی‌دا دزانت.

# پشکا سێ (٣)

## نیقودیموس سەرا عیسای ددەت:

[١] بەلێ مرۆڤەک ژ فەریسییا ناڤێ وی نیقودیموس بوو، ئێک بوو ژ سەرۆکێت جوهییا، [٢] ب شەڤێ هاتە دەڤ عیسای و گۆتێ: «رابی، ئەم دزانین تو مامۆستایەکی ژ دەڤ خودێ یێ هاتی، چونکو کەس نەشێت وان نیشانێت تو دکەی بکەت هەکەر خودێ ل گەل نەبیت.» [٣] ئینا عیسای بەرسڤا وی دا: «ب راستی ب راستی دبێژمە تە: کەس نەشێت پاشاتییا خودێ ببینیت هەکەر جارەکا دی ژ دایک نەبیت.» [٤] ئینا نیقودیموسی پسیار ژێ کر: «دێ چاوا مرۆڤ ژ دایک بتەڤە و ئەو یێ دناڤ سالادا چۆی؟ ئەرێ ما دێ چتە د زکێ دایکا خۆدا و پاشی ژ دایک بیت؟» [٥] ئینا عیسای بەرسڤا وی دا: «ب راستی ب راستی دبێژمە تە: کەس نەشێت بچتە پاشاتییا خودێ هەکەر ژ ئاڤێ و روحێ ژ دایک نەبیت. [٦] ئەوێ ژ لەشی دبیت لەشە، و یێ ژ روحێ دبیت روحە. [٧] ڤێجا تو نەگوهشە هەکەر ئەز بێژمە تە هوین پێتڤی هندێنە کو جارەکا دی ژ دایک ببن ڤە. [٨] بای کیڤە دڤێت دچیت و تە گوه ل فیتێنا وی هەیە، بەلێ تو نزانی ژ کیڤە دئێت و دێ کیڤە چیت. هەروەسا یێ ژ روحێ ژ دایک ببیت

وەسانە.» [٩]ئینا جارەکا دی نیقودیموسی پسیار کر: «دێ چاوا ئەڤ تشتە چێببیت؟» [١٠]ئینا عیسای بەرسڤا وی دا: «تو مامۆستایێ ئیسرائیلیێ‌یی و تو ڤێ نزانی؟ [١١]ب راستی ب راستی دبێژمە تە ئەم وێ دبێژین یا ئەم دزانین، و شەهدەکیێ ب وێ ددەین یا مە دیتی، و دسەر هندێ‌را هوین شەهدەکی یا مە وەرناگرن. [١٢]هەکەر من بۆ هەوە بەحسا کاروبارێت ئەردی کربیت و باوەریێ نەئینن، ئەرێ هوین دێ چاوا باوەریێ ئینن هەکەر ئەز بۆ هەوە بەحسا کاروبارێت ئەسمانا بکەم؟ [١٣]و کەسەک نەچۆیە ئەسمانا هەکەر ئەو نەبیت یێ ژ ئەسمانا هاتی، و ئەو ژی کورێ مرۆڤە ئەوێ ل ئەسمانا. [١٤]و کا چاوا موسای مار ل بیابانێ هلاویست هەروەسا دڤێت کورێ مرۆڤ بێتە هلاویستن [١٥]داکو ژیانا هەروهەر هەبیت بۆ هەر کەسەکێ باوەریێ پێ بینیت. [١٦]چونکو خودێ وەسا حەژ دونیایێ کر کو کورێ خۆ یێ ئێکانە دایێ داکو هەچیێ باوەریێ پێ بینیت هلاک نەبیت، بەلێ ژیانا هەروهەر بۆ وی بیت. [١٧]خودێ کورێ خۆ یێ ئێکانە نەهنارتیێە دونیایێ داکو داد بکەت، بەلێ داکو دونیایێ پێ قورتال بکەت. [١٨]ئەوێ باوەریێ پێ بینیت نائێتە دادکرن، بەلێ ئەوێ باوەریێ پێ نەئینیت بریارا دادکرنێ ل سەر هاتە دانێ چونکو باوەریێ ب ناڤێ کورێ خودێ یێ ئێکانە نائینیت.

[١٩] و دادوەری ئەڤەیە: ڕۆناهی هاتە دونیایێ، بەلێ خەلکی حەژ تاریێ کر پتر ژ ڕۆناهیێ، چونکو کارێت وانا دخراب بوون. [٢٠] ڤێجا هەچیێ کارێ خراب بکەت کەربا وی ژ ڕۆناهیێ ڤەدبت و ژبەر دەڤت داکو کریارێت وی دیار نەبن. [٢١] بەلێ ئەوێ ب ڕاستیێ کار دکەت دئێتە بەر ڕۆناهیێ داکو کارێت وی دیار بن و دیار بیت کو ب خودێ پێت هاتینە کرن.»

## شەهدەکییا یوحەننای بۆ عیسای یا دوماهیێ:

[٢٢] و عیسا و شاگردێت خۆ پشتی هینگێ چۆنە وەلاتێ یەهودییێ و ل گەل وانا ئاکنجی بوون و دەست ب ژێراڤکرنێ کر. [٢٣] و یوحەننای ژی ل عێن نون ژێراڤکرن دکر ل نک سالیم چونکو ل وێرێ ئاڤ مشە بوو و خەلک دهاتن و دهاتنە ژێراڤکرن. [٢٤] هینگێ یوحەننا هێشتا نەهاتبوو زیندان کرن. [٢٥] و کێش و ڤەکێشەک دناڤبەرا شاگردێت یوحەننای و جوهییەکیدا پەیدا بوو ل سەر تافیرکرنێ [٢٦] و چۆنە دەڤ یوحەننای و گۆتنێ: «ئەی رابی: ئەو زەلامێ مە ل گەل تە دیتی ل پشت رویبارێ ئوردن، و ئەوێ تە شەهدەکی بۆ دای، ئەو ژی ژێراڤکرنێ دکەت و هەمی دچنە دەڤ وی.» [٢٧] ئینا یوحەننای بەرسڤ دا: «کەس نەشێت تشتەکی ب دەست خۆڤە بینیت

هەکەر ژ ئەسمانا بۆ نەهاتبیتە دانێ. [٢٨] هوین شەهدەکیێ ددەن کو من گۆت: ئەز نە مەسیحم، بەلێ ب تنێ ئەز پێشرەوێ وی‌مە. [٢٩] و هەچیێ بویک بۆ وی بیت، ئەو زاڤایە. بەلێ هەڤالێ زاڤای، ئەوێ نێزیکی وی رادوەستیت و گوهـ لێ دبیت، ب دەنگێ زاڤای دلخۆش دبیت. و ئەڤە دلخۆشی‌یا من ب جهـ هات. [٣٠] و دڤێت ئەو زێدە بیت و ئەز کێم بم.»

[٣١] ئەوێ ژ ئەسمانا بێت- ئەو دسەر هەمیارا. بەلێ هەچیێ ژ ئەردی بیت ئەو ژ ئەردی‌یە و ئاخفتنێت ئەردی دکەت. یێ ژ ئەسمانا هاتی ب سەر هەمیا کەتی‌یە، [٣٢] و ئەو شەهدەکیێ ددەت ب یا دیتی و گوهـ لێ بووی. و کەس شەهدەکی‌یا وی ناوەرگریت، [٣٣] بەلێ ئەوێ شەهدەکی‌یا وی وەردگریت پەسند دکەت کو خودێ یێ راستە. [٣٤] چونکو ئەوێ خودێ هنارتی ب پەیڤێت خودێ دئاخڤیت، چونکو خودێ روحێ بێ هژمار ددەت. [٣٥] ڤێجا باب حەژ کوڕی دکەت و هەمی تشت یێ کری‌یە د دەستێ وی‌دا. [٣٦] هەچیێ باوەریێ ب کوڕی بینیت، ژیانا هەروهەر بۆ وی‌یە، و هەچیێ باوەریێ ب کوڕی نەئینت ئەو ژیانێ نابینیت بەلێ دێ تۆرەبوونا خودێ ل سەر مینیت.

# پشکا چارێ (٤)

## ژنکا سامەری ئاما ئاڤا ژیانێ دکەت:

[١] و دەمێ خودانی زانی کو فەریسیا گوه لێ بوو کو ئەو ژ یوحەننای پتر شاگردا وەردگرت و پتر ژێ ژێراڤکرنێ ژی دکەت [٢] – و هەرچەندە عیسای ژێراڤکرن نەدکر، بەلێ شاگردێت وی دکرن – [٣] ئینا دەڤەرا یەهودیێ هێلا و ڤەگەڕیا دەڤەرا جەلیل.

[٤] و دڤیا ئەو دناڤ دەڤەرا سامیرەرا ببۆریت. [٥] و گەهشتە باژێرەکێ دگۆتنێ سوخار، نێزیکی وی ئەردی بوو ئەوێ یەعقوبی دابیە کوڕێ خۆ یوسڤی، [٦] و بیرا یەعقوبی ل وێرێ بوو. و دەمێ عیسا ب رێڤە وەستیای، ل سەر لێڤا بیرێ روینشت، و هینگێ دەمژمێر شەشێ بوو ژ رۆژێ. [٧] و ژنکەکا سامیری هات داکو ئاڤێ ببەت. ئینا عیسای گۆتێ: «بێ زەحمەت ئاڤێ بدە من.» [٨] و شاگردێت وی چۆبوونە باژێری داکو خوارنەکێ بکڕن. [٩] ئینا ژنکا سامیری گۆتێ: «تو جوهیی و ئەز سامیریمە، تو چاوا ژ من داخواز دکەی ئاڤێ بدەمە تە؟» چونکو جوهیا دان و ستاندن ل گەل خەلکێ سامیرە نەدکرن. [١٠] ئینا عیسای بەرسڤا وێ دا: «هەکەر تە دانا خودێ زانیبا و کا کی یە دبێژتە تە: «ئاڤێ بدە من»، تو

دا ژێ داخــوازكــەى و ئەو دا ئاڤـا ژیانێ دەتە تە.» [11] ئینا ژنكێ گــۆت: «بەلێ ئەز خــودام، چو دەولک ل گەل تە نینن و بیـر یا کـویرە. ئەرێ تو دێ ئاڤـا ژیانێ ژ کیرێ ئینی؟ [12] ئەرێ ما تو ژ بابێ مە یەعقوبی مەزنتری ئەوێ ئەڤ بیرە بۆ مە پاش خۆڤە هێلای و ئەوی و کورێت وی و کەوالیێت وی ژێ ڤـەخـوارین؟» [13] ئینا عـیـسـاى گۆتێ: «هەچیێ ژ ڤێ ئاڤێ ڤەخۆت دێ تێهنی بیتە ڤە، [14] بەلێ ئەوێ ژ وێ ئاڤـا ئەز ددەمێ ڤـەخـۆت ئێـدى چو جـارا تێـهنی نابیت، بەلێ ئەو ئاڤـا ئەز ددەمێ دێ بتـە كانیەكا بلقهاڤێژ و ژیانا هەروهەر دەتێ.» [15] ئینا ژنكێ گۆتێ: «ئەز خودام، ژ ڤێ ئاڤێ بدە من داكو تێهنی نەبم و ئێدى ناڤەگەرمە ڤـێرێ داكو ئاڤێ ببەم.» [16] ئینا گۆتێ: «هەرە و داخوازا مێرێ خۆ بكە و پاشى ڤەگەرە ڤـێرێ.» [17] ئینا بەرسڤ دا: «من چو مێـر نینن.» ئینا گۆتێ: «تە راست گۆت دەمێ تە گۆتی: «من مێـر نینە.» [18] تە پێنج مێـر هەبوون، و ئەوێ نۆكە تو ل گەل دژى نە مێرێ تەیە. تە ئەڤە راست گۆت.» [19] ئینا ژنكێ گۆت: «ئەز خودام، ئەز دبێـژم تو پێـغـەمـبـەرى. [20] بابكالێت مـە ل ڤى چیاى خودێ پەرست و هوین جوهى درشتن كو ئورشەلیم ب تنێ دڤێت بنگەهێ پەرستنێ بیت.» [21] ئینا عـیـسـاى بەرسڤا وێ دا: «باوەر بكە ژنكێ، دێ ئەو دەم ئێت هوین

بابی نە ل ڤی چیای و نە ل ئورشەلیم بپەرێسن. [٢٢] هوین وی تشتی دپەرێسن یێ کو هوین نزانن، بەلێ ئەم وی دپەرێسین یێ دزانین، چونکو قورتالبوون ژ دەڤ جوهییانە. [٢٣] و دێ دەمەک ئێتن، و ئەو ب خۆ ڤێ گاڤێ‌یە، دەمێ پەرستکارێت راست بابی ب روح و راستیێ دپەرێسن، چونکو باب ل پەرستکارێت هۆسا دگەرێت. [٢٤] خودێ روحە، و ل سەر پەرستکارێت وی ئەوە ب روح و راستیێ بپەرێسن.» [٢٥] ئینا ژنکێ گۆتێ: «ئەز دزانم یێ روونکری ئەوێ دبێژنێ مەسیح دێ ئێتن، و کەنگی هات دێ بۆ مە هەمی تشتی دیار کەت.» [٢٦] بەرسڤا وێ دا: «ئەز ب خۆ ئەوم، ئەڤەیە ل گەل تە دئاخڤیت.»

[٢٧] و هینگێ شاگرد گەهشتن و گوهشین دەمێ دیتین یێ ل گەل ژنکەکێ دئاخڤیت. و دسەر هندێ‌را کەس ژ وان نەگۆت: «تە چ دڤێتن؟» یان «تو بۆچی ل گەل وێ دئاخڤی؟» [٢٨] ئینا ژنکێ جەرکێ خۆ هێلا و ڤەگەریا بازێری و گۆتە خەلکی: [٢٩] «وەرن، بەرێ خۆ بدەنێ زەلامەکی ئەوا من کری هەمی بۆ من دیار کر. چێدبیت ئەو مەسیح بیت؟» [٣٠] ئینا خەلکێ سوخار دەرکەفتن و چۆنە دەڤ.

[٣١] و د وی دەمی‌دا شاگردا دگۆتێ و ژێ‌ڤە نەدبوون: «ئەی رابی بخۆ!» [٣٢] ئینا بەرسڤا وان دا: «من خوارنەکا

هەی ئەز دخۆم هوین نزانن کا چی یە!» [٣٣] ئینا شاگردا گۆتە ئێکودوو: «ئەرێ کەسەکی تشتەک بۆ ئینایە دا بخۆت؟» [٣٤] ئینا عیسای گۆتە وان: «خوارنا من ئەوە کو ئەز ب ڤیانا وی بکەم یێ ئەز هنارتیم و کارێ وی ب جھ بینم. [٣٥] ما هوین نابێژن: «پشتی چار هەیڤا دێ دەمێ دورینێ ئێت» ؟ بەلێ ئەز دبێژمە هەوە: هوین باش بەرێ خۆ بدەنە زەڤیا - یێت گەهشتین و دەمێ دورینا وان یێ هاتی! [٣٦] و پالێ دورینێ کرێیا خۆ وەردگریت و فێقی بۆ ژیانا هەروهەر کۆم دکەت، داکو جوتیار و پالێ دورینێ پێکڤە دلخۆش بن. [٣٧] د ڤێ چەندێدا راستییا ڤێ گۆتنێ دیار دبت: «ئێک دچینیت و یێ دی ددوریت.» [٣٨] من هوین هنارتن داکو هوین وی بدورین یا کو هوین پێڤە نەوەستیاین. هندەکێت دی یێت وەستیاین، و هوین بەرێ وەستیانا وان دچن.»

[٣٩] ئینا گەلەکا ژ خەلکێ سامیرە ژبەر ئاخفتنا ژنکێ باوەری پێ ئینا ئەوا دگۆت: «هەچی یا من کری بۆ من ئاشکرا کر.» [٤٠] دەمێ سامری هاتنە نک داخواز ژێ کرن ل دەڤ وان بمینیت، و دوو رۆژا ل دەڤ وان ما. [٤١] و ژبەر ئاخفتنا وی ژمارا ئەوێت باوەری پێ ئیناین گەلەک زێدە بوو [٤٢] و گۆتنە ژنکێ: «نە هەر ژبەر ئاخفتنا تە ئەم باوەرێ دئینین، بەلێ چونکو مە ب گوهێت خۆ گوه لێ

بوو و مە زانی ئەو ب راستی قورتالکەرێ دونیایێ‌یە.»

**ساخکرنا کورێ ناڤمالیێ پاشای:**

[43] و پشتی هەردوو رۆژ ل سوخار ب دوماهی هاتین عیسای ب جە هێلا و چۆ دەڤەرا جەلیل، [44] چونکو ئەوی ب خۆ گۆتبوو کو پێغەمبەرا دناڤ گەلێ خۆدا روومەت نینە. [45] و دەمێ گەهشتی‌یە جەلیل خەلکێ وێ پێشەوازی لێ کر. ئەوان هەچی یا وی ل ئورشەلیم کری دیتبوو ل دەمێ جەژنا دەربازبوونێ چونکو ئەو ژی چۆبوونە جەژنێ.

[46] و عیسا گەهشتە قانا ل جەلیل، ئەو جهێ ئاڤ لێ کری‌یە مەی. و ل کەفەرناحوم زەلامەک هەبوو ناڤمالیێ پاشای بوو. کورەکێ نەخۆش هەبوو [47] و دەمێ گوه لێ بووی کو عیسای دەڤەرا یەهودیێ ب جە هێلا و هاتە جەلیل چۆ دەڤ و داخواز ژێ کر کو بێتە کەفەرناحوم داکو کورێ وی یێ ل بەر دەراڤێ مرنێ ساخ بکەت. [48] ئینا عیسای گۆت: «هوین باوەریێ نائینن هەتا هوین نیشانێت سەیر نەبینن.» [49] ئینا زەلامی هیڤی ژێ کرن و گۆت: «ئەز خولام، ل گەل من وەرە ژ بەری کورێ من بمرت!» [50] ئینا عیسای بەرسڤا وی دا: «هەرە، کورێ تە یێ ساخە.» ئینا زەلامی باوەری ب وێ پەیڤا عیسای گۆتیێ

ئینا و چۆ. [٥١]دەمێ ئەو ب رێ دچۆ هندەک کـریلێت وی گـەهشـتنێ و مـزگـینی دانێ کـو کـوڕێ وی یێ سـاخـە. [٥٢]ئینا پسـیـارا وان کر: «چ دەم بوو ساخ بووی؟» ئەوان بەرسڤ دا: «دوهی ئێڤاری دەمژمێر حەفت تای لێ نەما.» [٥٣]بابێ وی زانی ئەو دەم بوو عیـسـای گـۆتییێ: «کـوڕێ تە یێ سـاخـە.» ئینا ئەوی و خـەلکێ مـالا وی هەمـیـیـا باوەری پێ ئینا. [٥٤]ئەڤـە نیـشـانا سـەیر یا دووێ بوو عیسـای کری پشتی دەرکەفتنا وی ژ یەهودییێ بۆ جەلیل.

## پشکا پێنجێ (٥)

### عیسا ل کانییا بیت حەسدا مرۆڤەکێ ساخ دکەت:

[١]و پشـتی هینگێ ل جەژنەکا جوهـیـیا عیـسا بەرەڤ ئورشەلیمێ سەرکەفت. [٢]و ل نێزیکی دەرگەهێ پەزی ل ئورشەلیمێ کانیەک هەبوو ب عبری دگۆتنێ بیت حەسدا ل رەخ و دوریێت وێ پێنج هۆل هەبوون. [٣]گەلەک نەخۆشـێت کـۆرە و سـەقـەت و شل خـۆ ل وان هۆلا درێژ کـربوون، ل هیڤی یا لڤلڤاندنا ئاڤێ بوون. [٤]چونکو فریشـتـەک دهات دناڤ بەرا دەمـەکی و دەمـەکیدا ئاڤـا برکێ دلڤلڤـاند، و ئەڤێ بەراهییا هەمییا دچۆ د برکێدا، دا ساخ بیت ژ هەر ئێشەکا لێ. [٥]و ل نک برکێ مرۆڤەک هەبوو بەری سیه و

هەشت سالا نەساخ بیوو. [٦] عیسای ئەو دیت یێ درێژ کری‌یە و زانی کو ئەڤە دەمەکی درێژە ئەو د ڤی کاودانی‌دا. ئینا ژێ پرسی: «تە دڤێت تو ساخ ببی؟» [٧] نەخۆشی بەرسڤ دا: «ئەز خولام، من کەس نینە من بهاڤێتە د برکێ‌دا دەمێ ئەو دلڤلڤت و چەند جارا من بزاڤا کری بچمە د برکێ‌دا بەلێ هندەکێت دی بەراهیکا من دچۆنە تێدا.» [٨] عیسای گۆتە وی: «رابە و گلدکا خۆ راکە.» [٩] و هەر د گاڤێ‌دا ئەو زەلام ساخ بوو و گلدکا خۆ هەلگرت و چۆ. و ئەو رۆژ شەمبی بوو.

[١٠] جوهییا گۆتە وی زەلامێ ساخ بووی: «ئەڤرۆ شەمبی‌یە. چێنابت بۆ تە تو گلدکا خۆ راکەی.» [١١] بەرسڤا وان دا: «ئەو زەلامێ ئەز ساخ کریم گۆتە من: گلدکا خۆ هەلگرە و هەرە.» [١٢] ژێ پرسین: «ئەو کی یە گۆتی‌یە تە گلدکا خۆ هەلگرە و هەرە؟» [١٣] ئەو نەخۆشێ ساخ بووی نەدزانی ئەو کی یە، چونکو عیسا ژ وێرێ چۆبوو، و گەلەک مرۆڤ ل وێرێ بوون. [١٤] پشتی هینگێ عیسای ئەو ل پەرستگەهێ دیت و گۆتە وی: «ئەڤە تو زڤری ساخلەم نەزڤریە گونەهێ هەکەر دێ خرابتر ب سەرێ تە ئێت.» [١٥] ئەو زەلام چۆ دا بێژتە جوهییا کو عیسای ئەوێ ساخ کری. [١٦] ڤێجا، چونکو عیسای ئەڤ کارە د رۆژا شەمبیێ‌دا دکر جوهی رابوون کاودانێ وی

نەخوّش کرن و لێ دگەڕیان دا بکوژن. [١٧] بەلێ عیسای گوّتە وان: «تا نوّکە بابێ من بێ کار دکەت. و ئەز ژی بێ کار دکەم.» [١٨] ژبەر ڤێ چەندێ بزاڤا جوهیيا پتر لێ هات بوّ کوشتنا عیسای، چونکو وی نە دەستورێ روّژا شەمبیێ شکاند و بەس، بەلکو وی دگوّت ژی کو خودێ بابێ وییە، و خوّ ئینا رێزا خودێ.

**دەستهەلاتدارییا کورێ مروّڤ:**

[١٩] عیسای گوّتە وان: «ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە کوڕ نەشێت چو تشتا ژ نک خوّ بکەت، بەلێ وێ دکەت ئەوا دبینت باب دکەت. هەر تشتەکێ باب بکەت، کوڕ ژی دکەت. [٢٠] چونکو باب حەژ کوڕی دکەت، و هەمی کارێت خوّ نیشا وی ددەت، و دێ کارێت ژ ڤێ مەزنتر نیشا دەت، دا هوین عەجێب گرتی بن. [٢١] هەروەکو باب مرییا رادکەتە ڤە و ساخ دکەت، هەروەسا کوڕ ژی دێ وی ساخ کەت یێ وی بڤێت. [٢٢] و باب دادوەرییا کەسێ ناکەت، بەلێ هەمی دەستهەلاتا دادکرنێ یا دایە کوڕی [٢٣] داکو هەمی قەدرێ کوڕی بگرن هەروەکو قەدرێ بابی دگرن. و یێ قەدرێ کوڕی نەگرت ئەو قەدرێ بابی ژی ناگرت ئەوێ کوڕ هنارتی.

[٢٤] ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە هەر کەسێ

گوه بدەته پەیڤا من و باوەریێ ب وى بینت ئەوێ ئەز هنارتیم دێ ژیانا هەروهەر بۆ وى بت، و نائێته دادکرن ل رۆژا دوماهیێ، چونکو ئەوێ ژ مرنێ دەرباز بوویە ژیانێ. [٢٥]ب راستى ب راستى دبێژمە هەوە ئەو دەمێ مرى گوه ل دەنگێ کورێ خودێ دبن دێ ئێت، نۆکە ئەو دەمە، و یێ گوه لێ دبیت دێ ساخ بت. [٢٦]چونکو هەروەکو بابى ژیان یا دناڤ خۆدا هەى، یا دایە کورى ژى ژیان دناڤ خۆدا هەبیت. [٢٧]و دەستهەلات یا دایێ دادوەریێ بکەت، چونکو ئەو کورێ مرۆڤە. [٢٨]ژ ڤێ سەرخلولە نەبن، دێ دەمەک ئێت ئەڤێت دناڤ گۆرادا هەمى دێ گوه ل دەنگێ وى بن[٢٩] و دێ ژ گۆرا دەرکەڤن: و ئەڤێت کارێت باش کرین دێ رابن بۆ ژیانێ و ئەڤێت کارێت خراب کرین دێ رابن بۆ سزادانێ. [٣٠]و ئەز نەشێم چو تشتا ژ نک خۆ بکەم، بەلێ ئەز دادوەریێ دکەم ل دویڤ ئەڤا من گوه لێ دبیت و دادوەریا من یا راستە، چونکو ئەز تشتا ل دویڤ ڤیانا خۆ ناکەم بەلێ ل دویڤ ڤیانا وى ئەوێ ئەز هنارتیم.»

**چەند شەهدەکێن بۆ دەستهەلاتداریا عیساى:**

[٣١]«هەکەر من بۆ خۆ شەهدەکى دابا دا شەهدەکیا من نەیە راست بت. [٣٢]بەلێ ئێکێ دى بۆ من شەهدەکیێ

ددەت، و ئەز دزانم کو شەهدەکییا وی بۆ من یا راستە. [33] هەوە هندەک هنارتنە نک یوحەننای و ئەوی بۆ راستییێ شەهدەکی دا. [34] ئەز شەهدەکییا مرۆڤا قەبیل ناکەم، لێ ژبەر قورتالبوونا هەوە ئەز ڤێ یەکێ دبێژم. [35] یوحەننا شەمالکەکا رۆن و گەش بوو، و هەوە پێ خۆش بوو دەمەکی ل بەر رۆناهییا وی بن. [36] بەلێ من شەهدەکییەکا مەزنتر ژ شەهدەکی یا یوحەننای یا هەی، ئەو ژی شەهدەکییا وان کارێت بابی گۆتییە من پێ رابم و ئەڤێت ئەز نۆکە دکەم، ئەو دیار دکەن کو ئەوی ئەزێ هنارتیم. [37] و ئەو بابێ ئەز هنارتیم ئەو ب خۆ ژی بۆ من شەهدەکییێ ددەت. و هەوە چو جارا گوه ل دەنگێ وی نەبوویە، و هەوە وێنێ وی ژی نەدیتییە، [38] و پەیڤا وی جهـ د دلێت هەوەدا نینە چونکو هوین باوەرییێ ب وی نائینن ئەوێ وی هنارتی. [39] هوین پەرتوکێت پیرۆز ب هیری دخوینن چونکو هوین ل وێ باوەرییێنە کو ئەو دێ هەوە بەنە ژیانا هەروهەر. ئەو پەرتوک ژی بۆ من شەهدەکییێ ددەن. [40] و هێشتا هەوە نەڤێت بێنە نک من دا هەوە ژیان هەبت. [41] ئەز مەزناهییێ ژ مرۆڤا ناوەرگرم، [42] بەلێ ئەز هەوە دنیاسم، و ئەز دزانم ڤیانا خودێ د دلێت هەوەدا نینە. [43] ئەز ب ناڤێ بابێ خۆ هاتم، هەوە پێشەوازییا من نەکر، بەلێ هەکەر ئێک ب ناڤێ خۆ هات

هوین پێشەوازیێ وی دکەن. [٤٤] و دێ چاوا باوەریێ ب من ئینن و هوین مەزناهیێ ژ ئێکودوو وەردگرن، بەلێ ئەو مەزناهی‌یا خودێ تەعالا ددەت ناخوازن؟ [٤٥] بەلێ هزر نەکەن ئەز دێ هەوە ل دەڤ بابی تاوانبار کەم، چونکو یێ هەی هەوە تاوانبار بکەت ئەو ژی موسایە ئەڤێ هەوە هیڤی‌یێت خۆ دانایە سەر. [٤٦] هەکەر هەوە باوەر ژ موسای کربا، دا هوین باوەریێ ژ من ژی کەن، چونکو وی یا ل سەر من نڤێسای. [٤٧] ڤێجا هەکەر هەوە باوەری ب وێ نەئێت ئەڤا موسای نڤێسای پا دێ چاوا باوەریێ ب پەیڤێت من ئینن؟»

## پشکا شەشێ (٦)

### عیسا خوارنێ ددەتە پێنج هزارا:

[١] پشتی وێ چەندێ عیسا ژ دەریاچا جەلیل دەرباز بوو، ئانکو دەریاچا تەبەریە، بۆ رەخێ بەرامبەر. [٢] و گەلەک ب دویڤ کەتن پشتی نیشانێت ساخکرنا وی بۆ نەساخا دیتین. [٣] و عیسا و شاگردێت خۆ ب سەرکەفتنە چیای و روینشتن. [٤] و جەژنا دەربازبوونێ یا جوهیا نێزیک بوو. [٥] و دەمێ عیسای سەح کریێ کۆمەکا مرۆڤا یا بەرەڤ وی‌ڤە دئێت، گۆتە فیلیپسی: «ئەم ژ کیرێ نانی

بکڕین دا ئەڤێت هە بخۆن.» [٦]و ئەڤە گۆتێ دا تاقی بکەت، چونکو عیسای دزانی کا دێ چ کەت. [٧]فیلیپسی بەرسڤا وی دا: «هەتا هەکەر ئەم بهایێ دوو سەد دینارا نانی بکڕین تێرا ناکەت کو هەر ئێکی پرتەکا بچویک ژێ بگەهتێ!» [٨]ئینا ئەندراوسێ برایێ شەمعون پەتروسی و ئەو ژی ئێکە ژ شاگردا گۆتێ: [٩]«کوڕکەکێ ل ڤێرێ هەی پێنج نانێت جەهی و دوو ماسییێت بچویک یێت ل گەل، بەلێ ما ئەڤە چی یە بۆ وەکو ڤێ کۆما مەزن؟» [١٠]عیسای گۆت: «بلا روینننە خوارا» و گەلەک کەسکاتی ل وێرێ بوو. ئینا زەلام روینشتن، و ژمارا وان نێزیکی پێنج هزارا بوون. [١١]عیسای نان هەلگرتن و سوپاسی کر، پاشی دابەش کرن ل سەر روینشتییا هندی وان ڤیای و هەروەسا ل هەردوو ماسییا ژی کر. [١٢]دەمێ تێر بووین، گۆتە شاگردێت خۆ: «ئەو پرتێت نانی ئەوێت ماین خڕڤە کەن دا چو بەرزە نەبیت.» [١٣]ئینا خڕڤە کرن، و دوازدە سەلکێت پرتێت نانی خڕڤە کرن ئەوێت ژبەر وانڤە ماین ژ هەر پێنج نانێت جەهی. [١٤]و دەمێ خەلکی ئەو نیشانا عیسای کری دیتێ، گۆتن: «راستە، ئەڤەیە ئەو پێغەمبەر ئەوێ دێ ئێتە دونیایێ.» [١٥]عیسای زانی کو چو نەمایە دێ وی ب خورتی کەنە پاشا، ئینا ب تنێ ڤەگەڕیا چیای.

**عیسا ل سەر ئاڤێ ب رێڤە دچیت:**

[١٦] دەمێ بوو شەڤ شاگردێت وی هاتنە خوارێ و چۆنە دەریاچێ [١٧] و ل قاییکەکێ سیار بوون و چۆنە کەفەرناحوم ل رەخێ بەرامبەری دەریاچێ. و تاری بوو و عیسا هێشتا نەگەهشتبوو وان. [١٨] و رەشەبایەکێ ب هێز هات و پێل رابوون. [١٩] دەمێ شاگردا نێزیکی چار-پێنچ هەزار گاڤا باسک لێ داین، دیت عیسا یێ نێزیکی قاییکێ دبیت ل سەر ئاڤێ ب رێڤە دچیت، ترسیان. [٢٠] ئینا گۆتە وان: «ئەز ئەوم، نەترسن.» [٢١] هێش داخواز ژێ نەکری کو ل قاییکێ سیار بیت، هەتا قاییک گەهشتییە جهێ وان ڤیای.

**نانێ ژیانێ:**

[٢٢] و ل رۆژا پاشتر ئەو کۆمێت ل رەخێ بەرامبەری دەریاچێ ماین ژ بۆ وان یەعیان بوو کو قاییکەک ب تنێ ل وێرێ هەبوو و شاگرد ب تنێ لێ سیار ببوون و چۆبوون و عیسا دگەل وان ل قاییکێ سیار نەببوو. [٢٣] پاشی هندەک قاییکێت دی ژ تەبەریێ هاتن و نێزیکی وی جهی ئەوێ نان لێ خوارین راوەستیان پشتی خودانی سوپاس

کری. [٢٤] و دەمێ کۆمێ عیسا و شاگردێت وی ل وێرێ نەدیتن ل وان قاییکا سیار بوون و هاتنە کەفەرناحوم ل عیسای دگەڕیان. [٢٥] دەمێ ل رەخێ بەرامبەری دەریاچێ دیتین، گۆتنێ: «رابی، تو کەنگی گەهشتییە ڤێرێ؟» [٢٦] عیسای بەرسڤا وان دا: «ب راستی ب راستی ئەز دبێژمە هەوە: هوین ل من دگەڕێن نە ژبەر کو هەوە نیشان دیتن بەلێ چونکو هەوە خوار و هوین تێر بوون ژ وان نانا. [٢٧] ل دویڤ خوارنا بعەفنت نەچن، بەلێ ل دویڤ خوارنا دمینت و ژیانا هەروهەر ددەت هەرن، ئەوا کوڕێ مرۆڤ دێ دەتە هەوە، چونکو خودێ یێ باب موهرا خۆ یا دانایە سەر کوڕی.» [٢٨] پسیار ژێ کرن: «ئەو چی کربارن خودێ ژ مە دڤێت بکەین؟» [٢٩] عیسای بەرسڤ دا: «ئەو کارێ خودێ دڤێت هوین بکەن ئەوە کو هوین باوەرییێ ب وی بینن ئەوێ وی هنارتی.» [٣٠] ڤێجا گۆتنێ: «ئەو چ نیشانە تو بکەی دا ببینین و باوەرییێ ب تە بینین؟ تو دشێی چ بکەی؟ [٣١] بابێت مە گەزو ل بەرییێ خوارن هەروەکو د پەرتوکێدا هاتی: **ژ ئەسمانا نان دانێ دا بخۆن!**» [زەبور ٧٨:٢٤] [٣٢] عیسای بەرسڤا وان دا: «ب راستی ب راستی ئەز دبێژمە هەوە: موسای نان ژ ئەسمانی نەدا هەوە، بەلێ بابێ منە ئەوێ نانێ ئەسمانی یێ دروست ددەتە هەوە. [٣٣] چونکو نانێ خودێ ئەوە یێ ژ ئەسمانی

دئێتـه خوارێ و ژیانێ ددەته دونیـایێ.» [٣٤] گۆتنه وی: «ئەی خـودان، ل هەمی دەمـا ڤی نانی بدە مـه.» [٣٥] عـیسـای بەرسـڤـا وان دا: «ئەزم نانێ ژیانێ. ئەوێ پێش منڤـه بێت برسی نابیت، و ئەوێ باوەرێ ب من بینیت چو جارا تێهنی نابیت. [٣٦] بەلێ من گـۆته هەوە، هەوە ئەز دیتم و هوین باوەرێ نائینن. [٣٧] چ کەسێ بابی دایە من دێ بۆ من ئێت، و ئەوێ بێته دەڤ من ئەز وی چو جارا ناهاڤێژمه ژ دەرڤه [٣٨] چونکو ئەز ژ ئەسمـانی هاتمه خوارێ، نه دا ئەز ڤیـانا خۆ تەمام کەم، بەلێ ڤیـانا وی ئەوێ ئەز هنارتیم. [٣٩] و ڤیـانا وی ئەوە کو ئەز نەهێلم ئەو کەسێت داینه من ببرێن، بەلێ ئەز وانا ل رۆژا دوماهیکێ ژ مرنێ راکەم. [٤٠] چونکو ڤیـانا بابێ من ئەوە هەر کەسێ کـورێ ببـینیت و باوەرێ پێ بینیت دێ ژیانا هەروهەر بۆ وی بیت، و ئەز دێ وی ل رۆژا دومـاهیـکێ ژ مـرنێ راکەم.»

[٤١] و جوهییا نەرازیبـوونا خۆ ل سەر عیسـای دیار کر چونکو گۆت: «ئەزم ئەو نانێ ژ ئەسمـانی هاتییە خوار.» [٤٢] و گـۆتن: «ئەرێ ئەڤه نه عـیسـایێ کورێ یوسڤییە، ئەوێ ئەم دایک و بابێت وی دنیـاسین، ئەو چاوا دبێژیت: ئەز ژ ئەسمانی هاتمه خوارێ!» [٤٣] عیسای بەرسڤا وان دا: «دناڤ بەرا خودا پته پتێ نەکەن! [٤٤] کەس نەشێت بێته

دەڤ من هەگەر بابێ ئەز هنارتیم وی رانەکێشت. و ئەز دێ وی ل رۆژا دوماهیکێ ژ مرنێ راکەم. [٤٥] د پەرتوکێت پێغەمبەرادا یا هاتی: **دێ هەمی ژ خودێ فێربن**[ئەشعیا ٥٤:١٣] و هەر کەسەکێ گوه بدەتە بابی و ژ وی فێرببیت دئێتە دەڤ من. [٤٦] و رامانا ڤێ نە ئەوە کو ئێکی باب یێ دیتی: کەسێ نەدیتی‌یە ب تنێ ئەو نەبیت ئەوێ ژ خودێ، ئەوی ب تنێ بابێ دیتی. [٤٧] ئەز ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە: ئەوێ باوەریێ ب من بینیت دێ ژیانا هەروهەر بۆ وی بیت. [٤٨] ئەزم نانێ ژیانێ. [٤٩] بابێت هەوە گەزو ل بەریێ خوارن و پاشی مرن. [٥٠] بەلێ ئەها ئەڤە ل ڤێرێ‌یە نانی ژ ئەسمانی هاتی‌یە خوار دا مرۆڤ ژێ بخۆت و نەمریت. [٥١] ئەزم نانێ ژیانێ ئەوێ ژ ئەسمانی هاتی‌یە خوار. هەکەر ئێکی ژ ڤی نانی خوار دێ هەتا هەتایێ ژیت، و نانێ ئەز پێشکێش دکەم ئەو لەشێ منە، ئەز گۆری دکەم داکو دونیا بژیت.»

[٥٢] و ڤێ ئاخفتنێ کێشەکا توند دناڤ بەرا جوهیادا چێکر و پسیار کرن: «ئەڤە چاوا دشێت لەشێ خۆ بدەتە مە ئەم بخوین؟» [٥٣] عیسای بەرسڤا وان دا: «ب راستی ب راستی ئەز دبێژمە هەوە: هەکەر هوین لەشێ کوڕێ مرۆڤ نەخۆن و خوینا وی نەڤەخۆن هەوە چو ژیان دناڤ خۆدا نابیت. [٥٤] هەچیێ لەشێ من بخۆت و خوینا من ڤەخۆت،

دێ ژیانا هەروهەر بۆ وی بیت و ئەز دێ وی ل رۆژا دوماهیکێ ژ مرنێ راکەم.[٥٥] چونکو لەشێ من خوارنا دروستە، و خوینا من ڤەخوارنا دروستە،[٥٦] و هەر کەسێ لەشێ من بخۆت و خوینا من ڤەخۆت دێ د مندا مینیت و ئەز د ویدا.[٥٧] و هەروەکو ئەز ب بابێ ساخ ئەوێ ئەز ڤریێ کریم دژیم، هەروەسا هەر کەسێ من بخۆت دێ ب من ژیت.[٥٨] ئەڤەیە ئەو نانێ ژ ئەسمانی هاتییە خوار، و ئەو نە وەکو گەزوییە ئەوا بابێت هەوە خواری و پاشی مرین، بەلێ هەر کەسێ ژ ڤی نانی بخۆت دێ هەتا هەتایێ ژیت.»[٥٩] ئەڤە هەمی عیسای ل کنیشتێ گۆت دەمێ ئەوی ل کەفەرناحومێ فێرکرن دکر.

## گەلەک ژ شاگردا عیسای دهێلن:

[٦٠] و دەمێ گەلەکا ژ شاگردێت وی گوه لێ بووین گۆتن: «ئەڤ پەیڤە چەندا ب زەحمەتە! کی دشێت گوهێ خۆ بدەتێ؟»[٦١] و عیسای زانی کو شاگردێت وی پتە پتێ ل سەر ڤێ چەندێ دکەن، پسیارا وان کر: «ئەرێ ئەڤ چەندەیە گومانێ دئێختە دلێ هەوە؟[٦٢] پا دێ چاوا بیت هەکەر هەوە کورێ مرۆڤ دیت یێ ب سەر دکەڤیتە وی جهی ئەوێ ئەو ژ کەڤندا لێ؟[٦٣] روح ژیانێ ددەت، بەلێ لەش چو مفای نادەت. ئەو ئاخفتنا ئەز پێ ئاخفتیم بۆ

هەوە ئەوە روح و ژیان. [٦٤] بەلێ هندەک ژ هەوە باوەرییێ نائینن!» چونکو عیسای ژ دەستپێکێ دزانی ئەو کینە باوەریێ پێ نائینن، و ئەو کی یە دێ بێبەختییێ لێ کەت. [٦٥] پاشی گۆت: «ژبەر وێ چەندێ من گۆتە هەوە: کەسەک نەشێت بێتە دەڤ من هەکەر باب وێ چەندێ نەدەتێ.» [٦٦] ژ وی دەمی گەلەک شاگردا ئەو هێلا، و ژێ ڤەقەتیان. [٦٧] و گۆتە هەر دوازدە شاگردا: «بەلکو هەوە ژی دڤێت هوین وەکو وان بچن.» [٦٨] شەمعون پەتروسی بەرسڤا وی دا: «دێ چینە دەڤ کێ، ئەی خودان؟ ئاخفتنا ژیانا هەروهەر یا ل دەڤ تە، [٦٩] و مە باوەری ب تە ئینا و زانی کو تو پیرۆزێ خودێیی!» [٧٠] عیسای گۆت: «ما نە من هوین هەر دوازدە ژێگرتن! و ل گەل وێ چەندێ ئێک ژ هەوە ئبلیسە.» [٧١] مەبەستا وی یەهودایێ کورێ شەمعونێ ئەسخەریوتی بوو، چونکو ئەو ژ وان دوازدا بوو، و ئەوە یێ وی بدەتە دەست.

## پشکا حەفتێ (٧)

**عیسا و برایێت خۆ:**

[١] پشتی هینگێ عیسای دەست ب هاتن و چۆنێ ل دەڤەرا جەلیل کر، خۆ دا پاش ژ هاتن و چۆنێ ل دەڤەرا

یەهودیێ چونکو جوهییا بزاڤا کوشتنا وی دکر. [٢]و دەمێ جەژنا کەپرە شینا یا جوهییا نێزیک بووی [٣]برایێت وی گوتە وی: «ڤێ دەڤەرێ بهێلە و هەرە یەهودیێ دا شاگردێت تە ژی ئەو کارێت تو دکەی ببینن! [٤]ئەوێ ناڤودەنگی دڤێت ل بەرزەیێ کار ناکەت، و هەکەر تو ڤان کریارا دکەی خۆ بۆ دونیایێ دیار کە.» [٥]برایێت وی ژی باوەری پێ نەبوو. [٦]عیسای بەرسڤا وان دا: «هێشتا دەمێ من نەهاتییە بەلێ دەمێ هەوە هەردەم یێ د جهێ خودایە. [٧]دونیا نەشێت کەربێت خۆ ژ هەوە ڤەکەت، بەلێ ئەو کەربێت خۆ ژ من ڤەدکەت، چونکو ئەز شەهدەکییێ ل سەر وێ ددەم کو کارێت وێ دخرابن. [٨]هوین سەرکەڤنە جەژنێ، بەلێ ئەز نۆکە سەرناکەڤمە ڤێ جەژنێ چونکو دەمێ من هێشتا نەهاتییە.» [٩]ئەڤە گۆتە وان و ل جەلیل ما.

### عیسا ب ئاشکرایی فێرکرنێ د پەرستگەهێدا دکەت:

[١٠]و پشتی برایێت وی چۆینە جەژنێ ئەو ژی چۆ هەروەکو ڤەشارتی، نە ئاشکرا. [١١]ل جەژنێ جوهی ل وی دگەریان و پسیار دکرن: «کا ئەو زەلام؟» [١٢]و گەلەک پست پست ل ناڤ بەرا جەماوەری هاتنە کرن دەربارەی

وی، هندەکا ژ وانا دگۆتن: «ئەو یێ باشە» و هندەکێت دی دگـــۆتن: «نە! ئەو مللەتی ب ســـەر دا دبەت.» [١٣] بەلێ کەس ژ وان نەدوێرییا ب ئاشکرایی بەحسا وی بکەت ژ ترسا جوهییادا.

[١٤] دەمێ جەژن نیــڤی بووی، عــیــســا ســەرکــەفــتــە پەرستگەهێ و دەست ب فـێـرکرنا خەلکی کـر. [١٥] جوهی مــەندەهۆش بوون و پســیــار کــرن: «چاوا ئەو ناڤــەرۆکێ پەرتوکـێت پیــرۆز دزانیت و ئەو نەهاتی‌یە فـێـرکـرن؟» [١٦] عـیسـای بەرسڤا وان دا: «فـێرکرنا من نە ژ نک منە، بەلێ ژ نک وی‌یە ئەوێ ئەز هنارتیم. [١٧] و هەر کـــەسێ دڤێت ب ڤـیـانا خودێ بکەت دێ زانیت کا فێرکرنا من ژ نک خودێ یە، یان ئەز ژ نک خۆ دئاخڤم. [١٨] هەر کەسێ ژ نک خۆ باخڤـیت مەزناهیێ بۆ خۆ داخـواز دکـەت، بەلێ ئەوێ داخوازی‌یا مەزناهیێ بۆ وی بکەت ئەوێ ئەو هنارتی ئەو یێ راســتــە چو چەوتی د وی‌دا نینن. [١٩] مـا مـوسـای دەستور نەدابوو هەوە؟ بەلێ کەس ژ هەوە کار ب دەستوری ناکەت! بۆچی هوین بزاڤا کوشتنا من دکەن؟» [٢٠] هەمییا بەرســـڤـــا وی دا: «جننەک یێ د تەدا! کێ دڤــێـت تە بکوژیت؟» [٢١] عــیــســای گـۆت: «من کـارەکی ب تنێ کـر هوین هەمی مەندەهۆش بوون. [٢٢] موسای هوین ب سننەت کــرنێ فــەرمــان کــربوون، و رامــانا ڤێ چەندێ نە ئەوە کــو

سنندت کرن بۆ موسای دزڤریت، بەلێ بۆ بابکالکا. ژبەر هندێ هوین مرۆڤا ب خۆ رۆژا شەمبیێ ژی سنندت کەن. [٢٣] هەکەر هوین رۆژا شەمبیێ خەلکی سنندت دکەن دا هوین دەستوورێ موسای نەشکێنن، ئەرێ هوین دێ ل سەر من تۆره بن چونکو من مرۆڤەک ب تەمامی ل رۆژا شەمبیێ ساخ کر؟ [٢٤] ل دویڤ تشتێ دیار دادکرنێ نەکەن، بەلێ دادکرنەکا راست بکەن.»

[٢٥] وی دەمی هندەکا ژ خەلکێ ئورشەلیمێ گۆتن: «ئەرێ ما ئەڤە ئەو نینە ئەوێ دڤیان بکوژن؟ [٢٦] ئەها ئەو یێ ب ئاشکرایی دئاخڤیت و کەس رێ لێ ناگریت. تو بێژی سەرۆکێت مە پشت راست بووینە کو ئەو ب راستی مەسیحە؟ [٢٧] بەلێ ئەڤی ئەم بنیاتێ وی نیاسین، و دەمێ مەسیح دئێت کەس نزانیت دێ ژ کیڤە ئێت.» [٢٨] عیسای دەنگێ خۆ بلند کر و ئەو یێ فێرکرنێ دکەت د پەرستگەهێ ڤە و گۆت: «هوین من دنیاسن و هوین دزانن ئەز ژ کیرێمە. و ئەز ژ نک خۆ نەهاتیمە بەلێ ئەوێ ئەز هنارتیم ئەو یێ راستە و هوین وی نانیاسن، [٢٩] بەلێ ئەز وی دنیاسم، چونکو ئەز ژ وی‌مە و ئەوی ئەز یێ هنارتیم.» [٣٠] جوهییا بزاڤ کر کو وی دەستەسەر کەن، بەلێ کەسەکی دەستێ خۆ درێژ نەکرێ، چونکو هێشتا دەمێ وی نەهاتبوو. [٣١] بەلێ گەلەکا ژ جەماوەری

باوەری پێ ئینا و گۆتن: «ئەرێ تو بێژی دەمێ مەسیح دئێت دێ پتر نیشانا کەت ژ ئەوێت ئەڤ زەلامە دکەت؟»
[٣٢] فەریسییا گوهـ ل پست پستا جەماوەری بوو ئەوا ل سەر وی دهاتە کرن. ڤێجا وان و سەرۆکێت قەشا هندەک زێرەڤان هنارتن دا وی بگرن. [٣٣] عیسای گۆتە وان: «ئەز دێ دەمەکێ کێم مینمە دگەل هەوە، پاشی دێ زڤرمە نک ئەوێ ئەز هنارتیم. [٣٤] هینگێ هوین دێ ل من گەرێن بەلێ هوین من نابینن، و هوین نەشێن بێنە جهێ ئەز لێ.»
[٣٥] جوهییا پسیار ژ ئێکودوو کرن: «وی ل بەرە کیڤە بچیت کو ئەم نەبینین؟ ئەرێ دێ چیتە بازێرێت یونانییا ئەوێت جوهی لێ بەلاڤە بووین و یونانییا فێرکەت؟ [٣٦] و رامانا ئاخفتنا وی چی یە دەمێ گۆتی: هوین دێ داخوازا من کەن و هوین من نابینن، و هوین نەشێن بێنە جهێ ئەز لێ؟»
[٣٧] ل رۆژا دوماهییێ ژ جەژنێ و ئەو مەزنترین رۆژێت وێ یە، عیسا راوەستیا و ب هەمی دەنگێ خۆ گۆت: «هەکەر ئێک تێهنی بوو بلا بێتە نک من و ڤەخۆت، [٣٨] هەروەکو پەرتوکێ گۆتی، هەر کەسێ باوەریێ ب من بینت دێ رویبارێت ئاڤا ژیانێ ژناڤ هناڤێت وی هورن.»
[٣٩] عیسای ئەڤ چەندە ل سەر وێ روحێ گۆت ئەوا ئەوێت باوەری پێ ئینای دا وەرگرن، و روح هێشتا نەدابوو

چونکو عیسا نەهاتبوو مەزنکرن.

[٤٠] دەمێ ئامادەبوویا ئەڤ ئاخفتنە گوهـ لێ بووی هندەکا ژ وانا گۆت: «راست ئەڤە ئەو پێغەمبەرە.» [٤١] و هندەکێت دی گۆتن: «ئەڤە مەسیحە» بەلێ هندەکا ژ وانا گۆت: «ئەرێ مەسیح دێ ژ جەلیل دەرکەڤیت؟ [٤٢] ئەرێ ما پەرتوکێ نەگۆتی‌یە مەسیح دێ ژ دویندەهێ داوودی ئێت، و ژ گوندێ بێت لەحم ئەوێ داوود لێ؟» [٤٣] وەسا ژبەر وی، جوداهی‌یا بۆچوونا ل ناڤ بەرا جەماوەری‌دا چێببوو. [٤٤] و هندەک ژ وانا دڤیا ئەوی بگرن، بەلێ کەسەکێ دەستێ خۆ درێژ نەکرێ.

[٤٥] و زێرەڤانێت پەرستگەهێ زڤرینە نک فەریسییا و سەرۆکێت قەشا، پسیارا وان کر: «هەوە ژبەر چ ئەو نەئینا؟» [٤٦] بەرسڤا وان دا: «چو مرۆڤ وەکو ڤی زەلامی نەئاخفتینە.» [٤٧] فەریسییا لێ ڤەگێرا: «ئەرێ هوین ژی ب سەردا چۆینە؟ [٤٨] ئەرێ هەوە دیت ئێک ژ سەرۆکا یان ژ فەریسییا باوەری پێ ئینای؟ [٤٩] بەلێ خەلکێ دەستووری نزانن، دنەفرەت کرینە.» [٥٠] بەلێ ئێک ژ وان، ئەوێ بەرێ هاتی‌یە نک عیسای کو نیقودیموس بوو [٥١] گۆتە وان: «ئەرێ دەستوورێ مە رێ ددەت ئێکی داد کەن بێ‌ی کول پێشیێ گوهـ بدەنە بەرگیری‌یا وی؟» [٥٢] ئەوا بەرسڤا وی دا: «ئەرێ تو ژی ژ جەلیلی؟

پەرتوکێ بخوینە و ببینە: نابت پێغەمبەر ژ جەلیل رابن!»
[٥٣] پاشی هەر ئێک چۆ مالا خۆ.

# پشکا هەشتێ (٨)

## سەرهاتییا ژنکا داماپیس:

[١] بەلێ عیسا چۆ چیایێ زەیتونێ. [٢] و ل دەمێ ئەلندێ زڤری پەرستگەهێ، و گەلەک جەماوەر ل دۆر خر بوو، و روینشت و ئەو فێردکرن. [٣] و مامۆستاییێت دەستوری و فەریسییا ژنکەک ب داماپیسیێ گرتبوو ئینا نک و ل نیڤا وان راوەستاند [٤] و گۆتنە وی: «مامۆستا، ئەڤ ژنکە دبەر مێرکەکیرا رازای یا هاتییە گرتن. [٥] و موسای د دەستوریێدا فەرمان یا ل مە کری ئەڤ ژنکێت ڤان کارا دکەن ب بەردە بارانکرنێ بێنە کوشتن. تو چ دبێژی؟» [٦] ئەڤ پسیارە ژێ کر دا وی تەنگاڤ بکەن و هێجەتەکێ پەیدا کەن وی پێ تاوانبار بکەن. بەلێ وی خۆ چەماند و ب تبلا خۆ ل سەر ئەردی دنڤیسی. [٧] بەلێ وان هەر پسیار ژێ کرەڤە، ڤێجا خۆ راست کر و گۆتە وان: «ئەو کەسێ دناڤ هەوەدا یێ بێ گونەه بت، بلا ل بەراهیێ بەرەکی دانتێ.» [٨] جارەکا دی خۆ چەماند و ل سەر ئەردی دنڤیسی. [٩] دەمێ وان گوه ل ڤێ ئاخفتنێ

بووی، ئێک ل دویڤ ئێکی چۆن و بەراهىیا هەمییا رهسپی، و عیسا ب تنێ ل وێرێ ما، و ژنک د جهێ خۆدا یا راوەستای بوو. [١٠] خۆ راست کر و گۆته وێ: «ژنێ، کانێنە ئەو؟ کەس ژ وان داد ل سەر تە نەکر؟» [١١] بەرسڤ دا: «نە خێر ئەز خودام.» گۆته وێ: «ئەزێ ژی تە داد ناکەم. هەرە و گوننەها نەکەڤە.»

## عیسا رۆناهىیا دونیایێیە:

[١٢] جارەکا دی عیسای گازی وان کر و گۆت: «ئەز رۆناهىیا دونیایێمە. یێ ل دویڤ من بێت ل تاریێ ناچیت بەلێ دێ رۆناهىیا ژیانێ بۆ وی بت.» [١٣] فەریسییا نەرازیبونا خۆ دیار کر و گۆتن: «تو نۆکە بۆ خۆ شەهدەکێ ددەی، و شەهدەکىیا تە چێنابت.» [١٤] بەرسڤ دا: «هەرچەندە ئەز شەهدەکێ بۆ خۆ ددەم شەهدەکىیا من راستە، چونکو ئەز دزانم ئەز ژ کێرێ هاتیمە و دێ چمە کێرێ، بەلێ هوین نزانن کا ئەز ژ کێرێ هاتیمە و دێ کیڤە چم. [١٥] هوین ب چاڤێ مرۆڤا دادکرنێ دکەن، بەلێ ئەز کەسێ داد ناکەم. [١٦] هەر چەندە من دادکرن کربا، دا یێ راست بت، چونکو ئەز ب تنێ دادکرنێ ناکەم، بەلێ ئەز و باب ئەوێ ئەز هنارتیم. [١٧] و یا نڤێسىیە د دەستورێ هەوەدا شەهدەکىیا دوو شاهدا یا

راستـه. [١٨] ئەز بۆ خـۆ شـەهدەکـیێ ددەم و ئەو بابێ ئەز هنارتیم ژی شەهدەکییێ بۆ من دکەت.» [١٩] ژێ پرسین: «کا بابێ تە؟» بەرسڤ دا: «هوین من نانیاسن و بابێ من ژی نانیـاسن. هەکـەر هەوە ئەز نیـاسـیـبـام دا بابێ من ژی نیـاسن.» [٢٠] عـیـسـای ئەڤ ئاخفـتنە ل نێزیکی سندۆقا پێشکێشییا گۆت دەمێ فێرکرنێ ل پەرستگەهێ دکر و کـەسێ ئەو دەسـتـەسـەر نەکـر، چونکو دەمێ وی هێـشـتـا نەهاتبوو.

[٢١] پاشی عـیـسـای گـۆتە وان: «ئەز دێ چم و دێ ل دویڤ من گەڕن، و دێ د گونەها خۆدا مرن. هوین نەشێن بێنە وی جهێ ئەز لێ.» [٢٢] ڤێجـا جوهیـیـا ژ ئێکودوو پرسی: «ئەرێ مەبەستا ئاخفتنا وی چی یە، «نەشێن بێنە وی جـهێ ئەز لێ؟» ئەرێ دێ خـۆ کـوژت؟» [٢٣] ئەڤـە بەرسڤا وی بوو: «هوین ژ خوارێنە، بەلێ ئەزی ژ سەلالم. هوین ژ ڤێ دونیـاییێنە، بەلێ ئەز نە. [٢٤] ژبەر هندێ من گـۆتە هەوە: هوین دێ د گـونەهێت خـۆدا مـرن، چونـکو هەکـەر هەوە باوەری نەئینا کـو ئەز ئەوم، دێ د گـونەهێت خۆدا مرن.» [٢٥] ژێ پرسین: «تو کی؟» عیسای بەرسڤ دا: «ئەز ئەو هەمیـمـە ئەڤـا من بۆ هەوە هەر دگـۆت. [٢٦] و من گـەلەک تشـتـێت هەین بێـژم و هەوە پێ داد بکەم. بەلێ ئەوێ ئەز هنـارتیم ئەو راسـتگۆیە، و ئەڤـا ئەز دبێـژمـە

دونیـــایێ ئەوە ئەوا من ژ وی گـــوه لێ بووی.» [٢٧] بەلێ ئەو تێ نەگەهشتن کو عیسای ب ڤێ ئاخفتنێ بەحسا بابی دکر. [٢٨] ژبەر هندێ عـیـســای گـۆتە وان: «دەمێ هوین کـوڕێ مـرۆڤ دهلاویسـن دێ زانن کـو ئەز ئەوم، و ئەز چو تشـتـا ژ نک خـۆ ناکەم، بەلێ ئەز وێ دبێژم ئەوا بابی ئەز پێ فـێـرکـریم. [٢٩] یێ ئەز هنارتیم یێ ل گـەل من و ئەز نەهێـلایە ب تنێ، چونکو ئەز هەر وێ دکـەم یا ئەو پێ رازی دبیت.» [٣٠] دەمێ عـیـســا ب ڤێ چەندێ دئاخـفـت گەلەکا باوەری پێ ئینا.

[٣١] گـۆتە وان جـوهـیێت باوەری پێ ئینای: «هەکـەر هەوە خـۆ د پەیڤـا مـندا راگـرت، هوین دێ ب راسـتی شـاگـردێت من بن، [٣٢] و دێ راسـتـیێ زانن و دێ راسـتی هەوە ئازاد کـەت.» [٣٣] جـــوهـیـــیـا بەرسڤ دا: «ئەم دویندەهێ ئیبـراهیـمیـنە، و ئەم چو جارا کویلێت کەسێ نەبووین! تو چاوا دبێـژیە مـــە: «هوین دێ ئازاد بن» ؟» [٣٤] عیسای بەرسڤا وان دا: «ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە: یێ گـوننەهێ بکەت دێ بتە کـویلێ گـوننەهێ. [٣٥] و کویلە هەتاهەتایێ ل مالا خودانێ خۆ نامینت بەلێ کوڕ دێ هەتاهەتایێ ل وێرێ مـینت. [٣٦] هەکـەر کـوڕی هوین ئازاد کرن دێ ب راستی ئازاد بن. [٣٧] ئەز دزانم هوین دویندەهێ ئیبراهیمینە، بەلێ هوین ل دویڤ کوشتنا من دگەڕێن،

چونکو پەیڤا من چو جه د دلێت هەوەدا نینه. [٣٨] ئەز ب وێ دئاخفم ئەڤا من ل نک بابی دیتی، و هوین ب وێ دکەن ئەڤا هەوە ژ بابێ خۆ گوه لێ بووی.»

[٣٩] بەرسڤ دان و گۆتن: «بابێ مە ئیبراهیمە!» عیسای گۆت: «هەکەر هوین کورێت ئیبراهیمی بان دا کارێت ئیبراهیمی کەن. [٤٠] بەلێ هوین ل دویڤ کوشتنا من دگەرێن و ئەز مرۆڤەکم ب وێ راستییا من ژ خودێ گوه لێ بووی بۆ هەوە ئاخفتم، و ئەڤ چەندە ئیبراهیمی نەکرییە. [٤١] هوین کارێت بابێ خۆ دکەن!» گۆتنە وی: «ئەم ژ داماپیسیێ نەبووینە! مە بابەکێ ب تنێ یێ هەی، ئەو ژی خودێ یە.» [٤٢] عیسای گۆتە وان: «دا حەژ من کەن هەکەر خودێ بابێ هەوە با، چونکو ئەز یێ ژ خودێ دەرکەفتیم. و ئەز ژ نک خۆ نەهاتیمە، بەلێ ئەوی ئەزێ هنارتیم. [٤٣] بۆچی هوین د ئاخفتنا من ناگەهن؟ چونکو هوین نەشێن گوهێ خۆ بدەنە پەیڤا من. [٤٤] هوین کورێت بابێ خۆ ئبلیسینە، و هەوە دڤێت ڤیانێت بابێ خۆ بکەن، چونکو ئەو ل دەستپێکێ کوژەک بوو، و ژ راستیێ دەرکەفتییە چونکو ژ راستیێ یێ ڤالایە. دەمێ ئەو درەوا دکەت ئەو جەهوەرێ خۆ دیار دکەت، چونکو ئەو درەوینە و بابێ درەوێیە. [٤٥] بەلێ چونکو ئەز راستیێ دبێژم، هوین ژ من باوەر ناکەن. [٤٦] کی ژ هەوە دشێت گونەهەکێ ل

سەر من دیار کەت؟ ڤێجا هەکەر ئەز راستییێ دبێژم، بۆچی هوین ژ من باوەر ناکەن؟ (٤٧) یێ ژ خودێ بت دێ گوهێ خۆ دەتە پەیڤا خودێ. بەلێ هوین گوهدارییێ ناکن چونکو هوین نە ژ خودێ نە!»

(٤٨) جوهییا گۆت: «ما ئەم راستییێ نابێژین دەمێ ئەم دبێژینە تە تو سامیری و یێ جنگرتی؟» (٤٩) بەرسڤا وان دا: «ئەز نە یێ جنگرتیمە، بەلێ ئەز قەدرێ بابێ خۆ دگرم و هوین من کرێت دکەن. (٥٠) ئەز داخوازا مەزناهیێ بۆ خۆ ناکەم، لێ ئێکێ دی یێ هەی بۆ من داخواز دکەت و ئەو دادوەرە. (٥١) ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە: یێ گوه بدەتە پەیڤا من هەتاهەتایێ مرنێ نابینت.» (٥٢) جوهییا گۆتێ: «نوکە ئەم پشت راست بووین کو تو یێ جنگرتی. ئیبراهیم مر و پێغەمبەر مرن، و تو دبێژی: «یێ ب پەیڤا من بکەت تام ناکەتە مرنێ.» (٥٣) ئەرێ تو ژ بابێ مە ئیبراهیمی مەزنتری ئەڤێ مری؟ خۆ پێغەمبەر ژی یێت مرین، تو خۆ چ دادنی؟» (٥٤) عیسای بەرسڤ دا: «هەکەر ئەز خۆ مەزن بکەم، مەزناهییا من چو نینە. بەلێ بابێ منە یێ من مەزن دکەت. و هوین دبێژن: «ئەو خودایێ مەیە.» (٥٥) هوین وی نانیاسن، بەلێ ئەز وی دنیاسم. بەلێ هەکەر من گۆتبا ئەز وی نانیاسم دا ئەز ژی وەکو هەوە درەوین بم. بەلێ ئەز وی دنیاسم و ب پەیڤا وی

دکەم. [٥٦] بابێ هەوە ئیبراهیم یێ ئومێدەوار بوو رۆژا من ببینیت و دیت و کەیفخۆش بوو.» [٥٧] جوهیا گۆتە وی: «ژیێ تە نەبوویە پێنجی سال. ئەرێ تە ئیبراهیم دیتی‌یە؟» [٥٨] عیسای گۆتە وان: «ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە: ئەز هەبووم بەری ئیبراهیم هەبت.» [٥٩] جوهیا بەر هەلگرتن دا وی بەردە باران کەن، بەلێ وی خۆ ڤەشارت و ژ پەرستگەهێ دەرکەفت.

# پشکا نەهێ (٩)

## ساخکرنا کۆرێ زکماک:

[١] دەمێ عیسا ب رێ دچۆ، مرۆڤەکێ د زکماک‌دا کۆرە بووی دیت. [٢] ئینا شاگردێت وی ژێ پرسین: «ئەی رابی، کی یە گونەهـ کری: ئەڤێ هە، یان دای و بابێت وی هەتا کو ب کۆرەیی ژ داییک بووی؟» [٣] عیسای بەرسڤا وان دا: «نە ئەوە گونەهـ کری، و نە دای و بابێت وی، بەلێ داکو کارێت خودێ ل سەر دیار ببن. [٤] ل سەر من ئەوە ئەز کارێت وی بکەم ئەوێ ئەز هنارتیم هێشتا دونیا رۆژە. دێ شەڤ ئێت، و کەسەک نەشێت چو کارا تێدا بکەت. [٥] هندی ئەز ل دونیایێ بم، ئەز رۆناهی‌یا دونیایێ‌مە.» [٦] ئەڤ چەندە گۆت و تف کرە ئاخێ و

هەرییەک ژێ چێکر، و پاشی دانا سەر چاڤێت کورەی [٧] و گۆتێ: «هەرە و خۆ ل کانییا سیلوام (ئانکو هنارتی) بشۆ.» ئینا چۆ و خۆ شوشت و ڤەگەڕیا چاڤ لێ درۆن. [٨] ئینا جیران و نێزیکێت وی ئەوێت ئەو ددیتن خوازەکی دکر پسیار کرن: «ئەرێ ما نەڤە ئەو نینە ئەوێ رویدنشت و خوازەکی دکر؟» [٩] ئینا هندەکا ژ وان گۆت: «ئەڤە ئەوە» و هندەکا گۆت: «نە، بەلێ وەکو وییە.» بەلێ وی بەرسڤ دا: «بەلێ ئەز ئەوم!» [١٠] ئینا گۆتنێ: «چاوا چاڤێت تە ساخ بوون؟» [١١] بەرسڤ دا: «ئەو زەلامێ ناڤێ وی عیسا هەرییەک چێکر و ل چاڤێت من دا، و گۆتە من: «هەرە کانییا سیلوام و خۆ تێدا بشۆ.» ئینا ئەز چۆم و من خۆ شوشت و چاڤێت من رۆن بوون!» [١٢] ئینا پسیار ژێ کرن: «و ئەو نۆکە ل کیرێیە؟» گۆت: «ئەز نزانم.»

[١٣] ئینا ئەو زەلامێ ژ بەری هینگێ کورە برنە دەڤ فەریسییا. [١٤] و ئەو رۆژا عیسای تێدا هەری چێکری و چاڤێت کورەی ساخ کرین شەمبی بوو. [١٥] و فەریسییا ژی پسیار ژێ کر کا چاوا چاڤێت وی ساخ بوون. ئەوی بەرسڤ دا: «هەری دانا سەر چاڤێت من و من خۆ شوشت و ئەڤە ئەز پێ دبینم!» [١٦] ئینا هندەک فەریسییا گۆت: «ئەڤ مرۆڤە نە ژ دەڤ خودێ یە چونکو دەستورێ شەمبیێ

دشکێنیت.» بەلێ هندەکا گۆت: «دێ چاوا زەلامەکێ گونەهکار شێت ڤان نیشانا کەت؟» و دوو بەرەکی کەتە ناڤ واندا. [١٧] و جارەکا دی پسیار ژ ئەڤێ کۆرە کرن: «تو دەربارەی وی چ دبێژی، ئەوێ چاڤێت تە ساخ کرین؟» ئینا بەرسڤا وان دا: «ئەو پێغەمبەرە.»

[١٨] و جوهییا باوەر نەکر کو ئەوی کۆرە بوو و پاشی چاڤ لێ رۆن بوون. و گازی کرنە دای و بابێت وی [١٩] و پسیار ژێ کرن: «ئەرێ ئەڤە ئەو کورێ هەوەیە، ئەوێ هوین دبێژن ژ زکماکدا بوو یێ کۆرە، پا چاوا نۆکە دبینیت؟» [٢٠] دای و بابێت وی بەرسڤ دان: «ئەم دزانین ئەڤە کورێ مەیە و کۆرە ژ داییک بوو، [٢١] بەلێ ئەم نزانین چاوا نۆکە دبینیت، و نزانین کا کێ چاڤێت وی ساخ کرینە. ئەو یێ مەزنە پسیارێ ژێ بکەن، ئەو ب خۆ دێ بەرسڤا هەوە دەت.» [٢٢] و دای و بابێت وی ئەڤ چەندە گۆت چونکو ژ جوهییا دترسیان. چونکو جوهییا خۆ کربوونە ئێک هەر ئێکێ دانێ بکەت عیسا مەسیحە ژ جڤاتا کنیشتێ دەربێخن. [٢٣] ژبەر ڤێ چەندێ گۆتن «ئەو یێ مەزنە پسیارێ ژێ بکەن.»

[٢٤] و پاشی جارەکا دی فەریسییا گازی کرە ئەوێ ژ بەری هینگێ کۆرە و گۆتنێ: «خودێ مەزن بکە. ئەم دزانین ئەڤ زەلامێ هەنێ یێ گونەهکارە.» [٢٥] ئینا

بەرسڤ دا: «ئەز نزانم گوننەهکارە یان نە. ئەز تشتەکێ ب تنێ دزانم: ئەز یێ کۆرە بووم و نوکە دبینم.» [۲۶] ئینا جارەکا دی پسیار ژێ کرن: «ئەوی چ ل تە کر؟ چاوا چاڤێت تە ساخ کرن؟» [۲۷] بەرسڤا وان دا: «من گۆتە هەوە و هەوە گوهـ نەدا من. بۆچی هەوە دڤێت جارەکا دی گوهـ لێ ببن؟ ئەرێ ما هەوە دڤێت هوین ژی ببنە شاگردێت وی؟» [۲۸] ئینا چڤێن دانێ و گۆتنێ: «تو شاگردێ وی! بەلێ ئەم شاگردێت موسایینە. [۲۹] ئەم دزانین خودێ ل گەل موسای ئاخفت بەلێ ئەڤی ئەم نزانین ژ کیڤە هاتییە.» [۳۰] ئینا زەلامی بەرسڤا وان دا: «ئەڤە تشتەکێ سەیرە! هوین نزانین ژ کیڤە هاتییە و ئەوی چاڤێت من ساخ کرن. [۳۱] ئەم دزانین خودێ گوهێ خۆ نادەتە گوننەهکارا، بەلێ گوهێ خۆ ددەتە وی یێ ژ خودێ ترس و ب ڤیانا وی دکەت. [۳۲] و نەهاتییە گوهـ لێ بوون ل هەمی سەردەما کو مرۆڤەکی چاڤێت کۆرەکی د زکماکدا ساخ کرین. [۳۳] هەکەر ئەو نە ژ خودێ با ئەوی نەدشیا چو بکەت.» [۳۴] ئینا لێ کرنە هەوار: «تو ب هەمیڤە د گوننەهێدا ژ داییک بووی، و تو مە فێردکەی؟» و پاشی دەرئێخستنە ژ دەرڤە.

[۳۵] و عیسای زانی یێ دەرئێخستین. ئینا چۆ نک و پسیار ژێ کر: «ئەرێ تو باوەریێ ب کورێ مرۆڤ

دئینی؟» [٣٦] ئەوی بەرسڤ دا: «ئەز خولام، ئەو كی یە دا ئەز باوەریێ پێ بینم؟» [٣٧] ئینا عیسای گۆتێ: «ئەوێ تە دیتی و ئەوێ ل گەل تە دئاخڤیت، ئەو ب خویە.» [٣٨] ئینا گۆت: «ئەز باوەریێ دئینم، ئەی خودان،» و خۆ بۆ چەماند. [٣٩] ئینا عیسا گۆت: «ئەز بۆ دادكرنێ یێ هاتمە ڤێ دونیایێ داكو كۆرە ببینن و یێت دبینن كۆرە بن.» [٤٠] و هندەك فەریسییێت ل گەل وی ئەو چەندە گوهـ لێ بوو و پسیار كر: «ئەرێ ما ئەم ژی دكۆرەینە؟» [٤١] ئینا عیسا بەرسڤا وان دا: «هەكەر هوین كۆرە بان، چو گونەها وە نەدبوو، بەلێ هوین دبێژن «ئەم دبینن،» ڤێجا گونەها هەوە دمینیت.»

## پشكا دەهێ (١٠)

**عیسایە شڤانێ باش:**

[١] «ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە ئەوێ نە د دەرگەهێ گۆڤێرا بچیتە ژۆرێ بەلێ د رێكەكا دیرا بچیتێ، دزە و جەردەیە. [٢] بەلێ ئەوێ د دەرگەهیرا دچیتە ژۆر، ئەو شڤانێ بەرخانە. [٣] نوبەدارێ دەرگەهی دێ بۆ وی ڤەكەت، و بەرخ دێ گوهێ خۆ دەنە دەنگێ وی، و دێ گازی كەتە بەرخێت خۆ، هەر ئێكی ب ناڤێ وی، و

دێ بەتە ژ دەرڤەی گۆڤێ. [٤]کەنگی هەمی ئینانە دەر دێ کەڤیتە بەراهیێ وان و ئەو دێ دەنە دویڤ چونکو ئەو دەنگێ وی دنیاسن. [٥]و ئەو ل دویڤ بیانی ناچن، بەلێ دێ ژێ رەڤن چونکو ئەو دەنگێ بیانییا نانیاسن.» [٦]عیسای ئەڤ نموونە بۆ وان ئینا، بەلێ ئەو ئارمانجا ئاخفتنا وی تێ نەگەهشتن. [٧]ژبەر هندێ گۆتە وان ڤە: «ب راستی ب راستی بۆ هەوە دبێژم: ئەز دەرگەهێ بەرخامە. [٨]هەمی ئەوێت بەری من هاتین دز بوون، بەلێ بەرخا گوهـ نەدایێ. [٩]ئەز دەرىمە. هەر کەسێ هاتە دناڤ مندا دێ قورتال بیت و دێ ئێتە ژۆر و دێ دەرکەڤیت و دێ کۆزێ بینیت. [١٠]دز دئێت بەس دا بدزیت و ڤەکوژیت و ژناڤ ببەت. بەلێ ئەز یێ هاتیم دا ژیان بۆ وان بیت و بۆ وان یا پر بیت. [١١]ئەزم شڤانێ باش، و شڤانێ باش ژیانا خۆ دبەر بەرخێت خۆدا ددەت. [١٢]و پالا نە وەک شڤانىیە، چونکو بەرخ نە سامانێ وینە. دەمێ ئەو گورگی دبینیت یێ دئێت، بەرخا دهێلیت دا خۆ قورتال کەت، ڤێجا گورگ بەرخا درەڤینیت و پەلاتە دکەت. [١٣]ئەو درەڤیت چونکو ئەو کرێگرتىیە و پیتەی ب بەرخا ناکەت. [١٤]ئەز شڤانێ باشم، و ئەز بەرخێت خۆ دنیاسم، و بەرخێت من ژی من دنیاسن، [١٥]وەکو باب من دنیاسیت و ئەز وی دنیاسم. و ئەز ژیانا خۆ دبەر بەرخێت

خۆدا دبەم. [١٦] و من هندەک بەرخێت دی ییێت هەین نە ژ ڤێ گۆڤێ‌نە، و دڤێت ئەز وان ژی بینمە نک خۆ، دا گوهـ بدەنە دەنگێ من و دێ بنە ئێک کەریێ پەزی دگەل ئێک شڤانی. [١٧] باب حەژ من دکەت چونکو ئەز ژیانا خۆ گۆری دکەم دا ئەز ڤەگەرینم. [١٨] کەس ژیانا من ژ من ناستینیت بەلێ ئەز ژ دەڤ خۆ دکەمە گۆری. من دەستهەلاتداری‌یا هەی ئەز بکەمە گۆری و من دەستهەلاتداری‌یا هەی ئەز ڤەگەرینم. ئەڤ فەرمانە من یا ژ بابێ خۆ وەرگرتی.»

[١٩] ب ڤێ گۆتنێ جارەکا دی دووبەندانێ کەفتە دناڤ جوهییادا. [٢٠] و گەلەکا ژ وانا گۆتن: «جننەکێ دناڤ وی‌دا و ژبەر خۆ دئاخڤیت. ڤێجا بۆچی هوین گوهـ ددەنە وی؟» [٢١] و هندەکێت دی گۆتن: «ئەڤە نە ئاخفتنا ئێکی‌یە ئەجنە دناڤ‌دا بیتن. ئەرێ ئەجنە دشێت چاڤێت کۆرا ساخ کەت؟»

## جوهی بزاڤێ دکەن عیسای بدۆرینن:

[٢٢] ل جەژنا نویکرنا پەرستگەهێ ل ئورشەلیم کو زڤستان بوو [٢٣] عیسا ل پەرستگەهێ ل هۆلا سلێمانی ل سەر لنگێت خۆ دگەریا. [٢٤] جوهی ل دۆر کۆم بوون و گۆتنە وی: «هەتا کەنگی دێ مە هێلی حێبەتی دەربارەی خو؟

هەکەر راستە تو مەسیحی، بۆ مە ئاشکرا بێژە.» [٢٥]عیسای بەرسڤا وان دا: «من گۆتە هەوە، بەلێ هوین باوەر ناکەن. ئەو کارێت ئەز ب ناڤێ بابێ خۆ دکەم، ئەو بۆ من شەهدەکێ ددەن، [٢٦]بەلێ هوین باوەر ناکەن چونکو هوین نە بەرخێت منن. [٢٧]بەرخێت من گوهـ ددەنە دەنگێ من، و ئەز وان دنیاسم و ئەو ل دویڤ من دئێن، [٢٨]و ئەز ژیانا هەروهەر ددەمێ و هەتا هەتایێ ژناڤ ناچن و کەس ژ دەستێ من ناستینیت. [٢٩]ئەو بابێ ئەو داینە من، ئەو ژ هەمییا مەزنترە، و کەس نەشێت تشتەکی ژ دەستێ بابێ من بستینیت. [٣٠]ئەز و باب ئێکین!»

[٣١]جارەکا دی جوهییا بەر بلند کرن دا بەردە باران کەن. [٣٢]عیسای گۆتە وان: «گەلەک کارێت باش من ژ دەڤ بابێ خۆ نیشا هەوە دان، و ژبەر ئەگەرا کیژ کاری ژ وان هوین دێ من بەردە باران کەن؟» [٣٣]بەرسڤا وی دان: «ئەم ژبەر کارێت باش تە بەردە باران ناکەین بەلێ ژبەر جڤینێت تە یێت ئیمانسزیێ. چونکو تو خۆ دکەیە خودێ، و تو مرۆڤی!» [٣٤]عیسای گۆتە وان: «ئەرێ ما د دەستورێ هەوەدا نە نڤیسییە: «**من یێ گۆتی هوین خودانە**»؟[زەبور ٨٢: ٦] [٣٥]هەکەر دەستور بێژتە ئەوێت پەیڤا خودێ بۆ هاتی «خودانە» – و پەرتوک نائێتە شکاندن– [٣٦]ئەرێ هوین دبێژنە ئەوێ بابی پیرۆز کری و هنارتی بۆ

دونیایێ: «تو جڤینێت ئیمانسزیێ ددەی،» چونکو من گۆت: ئەز کورێ خودێ مە؟ [٣٧] هەکەر ئەز کارێت بابێ خۆ نەکەم هوین ژ من باوەر نەکەن. [٣٨] بەلێ هەکەر ئەز وە بکەم، باوەر ژ وان کارا بکەن، هەکەر هوین باوەر ژ من نەکەن. وی دەمی هوین دێ زانن و دێ بۆ هەوە دیار بیت کو باب یێ د مندا و ئەز یێ د ویدا.» [٣٩] جارەکا دی دڤیان وی بگرن بەلێ ئەو ژ دەستێت وان قورتال بوو.

[٤٠] و ڤەگەریا لایێ دی یێ رووبارێ ئوردن، جهێ یوحەننای بەری نۆکە ژێراڤکرن لێ دکر، و ل وێرێ ما. [٤١] گەلەک هاتنە دەڤ و وان دگۆت: «یوحەننای نیشانەکا ب تنێ نەکر، بەلێ هەر تشتێ وی گۆتی دەربارەی ڤی زەلامی راست بوو.» [٤٢] و گەلەکا ل وێرێ باوەری پێ ئینا.

## پشکا یازدێ (١١)

### مرنا لەعازەری:

[١] مرۆڤەک نە ساخ بوو ناڤێ وی لەعازەر بوو، ئەو ژ بێت عەنیا بوو گوندێ مەریەمێ و مەرتایا خویشکا وێ. [٢] و ئەڤ مەریەمە ئەو بوو ئەڤا ب گولاڤێ پێت عیسای روونکرین و ب پرچا خۆ پاقژ کرین و لەعازەر برایێ وێ بوو. [٣] هەردوو خویشکا هنارتە دویڤ عیسای و گۆتنێ:

«خودان، ئەوێ تو حەژێ دکەی یێ نەساخە.» [٤] دەمێ گوهـ ل ڤێ چەندێ بووی گۆت: «ئەڤ نەساخی‌یە ب مرنێ ب دوماهیک نائێت، بەلێ دێ بتە مەزناهی بۆ خودێ و مەزناهی بۆ کورێ خودێ ب رێیا وێ.» [٥] و عیسای ژی حەژ مەرتایێ و خویشکا وێ و لەعازەری دکر. [٦] ئەو دوو رۆژێت دی ژی ل جهێ خۆ ما پشتی ب نەساخی‌یا لەعازەری زانی. [٧] پشتی هینگێ گۆتە شاگردێت خۆ: «دا بزڤرینە دەڤەرا یەهودییێ.» [٨] شاگردا گۆتێ: «رابی، دێ زڤریە یەهودییێ و بەری دەمەکێ کورت جوهییا دڤیا تە بەردە باران بکەن؟» [٩] عیسای بەرسڤ دا: «ما رۆژ نە دوازدە دەمژمێرن؟ ڤێجا ئەڤێ ب رۆژێ بگەرێت ناهلنگڤت، چونکو رۆناهی‌یا ڤێ دونیایێ دبینت. [١٠] بەلێ ئەوێ ب شەڤێ بگەرێت دێ هلنگڤت، چونکو رۆناهی تێدا نینە.» [١١] پاشی عیسای گۆت: «لەعازەر خۆشتڤی‌یێ مە یێ نڤستی، بەلێ ئەز دێ چم دا وی راکەم.» [١٢] شاگردا گۆتێ: «ئەی خودان، هەکەر ئەو نڤستبت، دێ چاک بتە ڤە.» [١٣] و مەبەستا عیسای مرنا لەعازەری بوو، بەلێ شاگردا هزر دکر کو یێ نڤستی‌یە. [١٤] پشتی هینگێ گۆتە وان: «لەعازەر یێ مری، [١٥] و ژبەر هەوە ئەزێ دلخۆشم چونکو ئەز ل وێرێ نەبووم، دا هوین باوەرییێ بینن. دا بچینە نک!» [١٦] تۆما ئەوێ

دگۆتنێ دیدیموس گۆته شاگردێت دی: «بلا ئەم ژی بچین دا ل گەل وی بمرین.»

## عیسا دئینته تازییا خویشکێت لەعازەری:

[١٧]و دەمێ عیسا گەهشتییه بێت عەنیا ئەو چار رۆژ بوو لەعازەر هاتییه ڤەشارتن. [١٨]و بێت عەنیا دۆروبەری سێ کیلۆمەترا ژ ئورشەلیمێ یا دویر بوو. [١٩]و گەلەک جوهی هاتبوونه تازییا مەرتایێ و خویشکا وێ. [٢٠] دەمێ مەرتایێ زانی کو عیسایێ هاتی، چۆ پێشەوازییا وی، بەلێ مەریەم ل مال ما. [٢١]و مەرتایێ گۆته عیسای: «ئەی خودان، هەکەر تو ل ڤێرێ بای برایێ من نەدمر. [٢٢]و نۆکە ژی ئەزا پشت راستم هەر چ تشتێ تو ژ خودێ داخواز بکەی دێ دەته تە.» [٢٣]عیسای بەرسڤ دا: «دێ برایێ تە رابت.» [٢٤] مەرتایێ گۆتێ: «ئەز دزانم ئەو دێ ل رابوونێ رۆژا دوماهیێ رابت.» [٢٥] عیسای گۆته وێ: «ئەزم رابوون و ژیان. یێ باوەرییێ ب من بینت، هەکەر مر ژی دێ ساخ بیته ڤە. [٢٦]و یێ ساخ بت و باوەرییێ ب من بینت نامرت هەتا هەتایێ. ئەرێ تو باوەرییێ ب ڤێ دئینی؟» [٢٧] بەرسڤا وی دا: «بەلێ ئەی خودان، من باوەرییا ئینای کو تو مەسیحی کورێ خودێیی ئەڤێ هاتییه ڤێ دونیایێ.»

[٢٨] پشتی ئەڤە گۆتی، چۆ گازی مەریەما خویشکا خۆ کر و ب دزیڤە گۆتێ: «مامۆستایێ ل ڤێرێ، و یێ داخوازا تە دکەت.» [٢٩] دەمێ ئەڤە گوه لێ بووی راست رابوو ڤە و ب لەز چۆ نک عیسای. [٣٠] و هێشتا ئەو نە گەهشتبوو گوندی بەلێ ل وی جهی بوو ئەوێ مەرتا لێ دیتی. [٣١] دەمێ ئەو جوهی یێت هاتینە تازی‌یا وان ئەو دیتی رابوویە ڤە و ب لەز دەرکەفتی، ل دویڤ چۆن چونکو وان هزر کر دێ چیتە نک گۆڕی کەتە گری. [٣٢] و دەمێ مەریەم گەهشتیە وی جهێ عیسا لێ دیتی خۆ هاڤێتە بەر پێیا و گۆتێ: «ئەی خودان، هەکەر تو ل ڤێرێ بای برایێ من نەدمر.» [٣٣] دەمێ عیسای ئەو دیتی یا دکەتە گری و جوهی‌یێت دگەل ژی دکرنە گری ب دلەکی کزری ئەرزنک راهێلان. [٣٤] پسیار کر: «هەوە ل کیرێ ڤەشارتی‌یە؟» بەرسڤ دا: «وەرە ئەی خودان و بنێرە.» [٣٥] و عیسای کرە گری. [٣٦] ڤێجا جوهییا گۆتە ئێکودوو: «بنێرن چەند حەژێ دکر.» [٣٧] بەلێ هندەکا پسیار کر: «ئەرێ ما ئەڤێ چاڤێت کۆرەی ساخ کرین نەدشیا لەعازەری ژی ژ مرنێ بپارێزت؟»

**عیسا لەعازەری ژ مرنێ رادکەت:**

[٣٨] ڤێجا جارەکا دی عیسای ئەرزنک راهێلان. و

نێزیکی گۆڕی بوو، و ئەو ژی شکەفتەک بوو، بەرەک ل سەر دەرگەهێ وێ بوو. [٣٩] گۆت: «بەری راکەن!» مەرتایا خویشکا مری گۆت: «ئەی خودان، ئەڤە چار رۆژە ئەو د ڤێرێدا. نۆکە گەنی بوویە.» [٤٠] عیسای گۆت: «ما من نەگۆتە تە: هەکەر تە باوەری ئینا دێ مەزناهی یا خودێ بینی؟» [٤١] ڤێجا بەر راکر. و عیسای چاڤێت خۆ بەرەڤ عەسمانا بلند کرن و گۆت: «ئەی باب، ئەز سوپاسی‌یا تە دکەم چونکو تە گوهـ ل من بوو. [٤٢] و من دزانی تو هەردەم گوهـ ددەیە داخوازێت من، بەلێ من ئەڤە گۆت ژبەر ئەڤێت رەخ و دۆرێت من دا باوەرییێ بینن کو تە ئەزێ هنارتیم.» [٤٣] پاشی ب دەنگەکێ بلند گازی کر: «ئەی لەعازەر، دەرکەڤە!» [٤٤] و مری دەرکەفت و کفن ل دەست و پێت وی د پێچای بوون و دەرسۆک ل سەرێ وی بوو. عیسای گۆتە ئەڤێت ل دەورێت وی: «ڤەکەن و بهێلن بچت.»

## پیلان ژ بۆ کوشتنا عیسای:

[٤٥] و گەلەک جوهی یێت هاتینە تازی‌یا مەریەمێ باوەری پێ ئینا دەمێ وان ئەو کارێ کری دیتی. [٤٦] بەلێ هندەک ژ وان چۆنە نک فەریسییا ئەو کارێت عیسای کرین گۆتنێ. [٤٧] ڤێجا سەرۆکێت قەشا و فەریسییا جڤاتەک گرێدا و گۆتن: «ئەم چ بکەین؟ ئەڤ

زەلامە پێ گەلەک نیشانا دکەت. [٤٨]و هەکەر مە هێلا وەسا دێ هەمی باوەرییێ پێ ئینن دێ رۆمانی ئێن و نەتەوێ مە ویران کەن.» [٤٩]ئێک ژ وان، ئەو ژی قیافا بوو سەرۆکێ قەشا ل وێ سالێ گۆت: «هوین چو نزانن. [٥٠]ما هوین نە ل وێ هزرێنە کو مرۆڤەک ب تنێ د پێخەمەتی مللەتیدا بمرت چێترە ژ کو مللەت هەمی هلاک بت؟» [٥١]و قیافای ئەڤ ئاخفتنە ژ نک خۆ نەکر، بەلێ چونکو ئەو ل وێ سالێ سەرۆکێ قەشا بوو پێشبینی کر کو عیسا دێ ل پێخەمەتی مللەتی مرت، [٥٢]و نە ب تنێ پێخەمەتی مللەتی بەلێ دا بچویکێت خودێ کۆم کەت و بکەتە ئێک نەڤێت بژالە. [٥٣]ژ وێ رۆژێ وەرە جوهییا شێورا خۆ کر دا عیسای بکوژن. [٥٤]ئێدی عیسا ب ئاشکرایی دناڤ واندا نەدگەریا، بەلێ چۆ بازێرەکی دگۆتنێ ئەفرایم، دکەڤتە نێزیکی بیابانێ، و دگەل شاگردێت خۆ ل وێرێ ما.

[٥٥]و جەژنا دەربازبوونا جوهییا نێزیک ببوو، و گەلەک ژ گوندا هاتنە ئورشەلیمێ ژ بەری جەژنێ دا خۆ تافیر بکەن. [٥٦]و ل عیسای دگەریان، و دەمێ ئەو ل پەرستگەهێ ل ئێکودوو راست دبوون پسیار دکرن: «هوین چ دبێژن، چێدبیت نەئێتە جەژنێ؟» [٥٧]سەرۆکێت قەشا

و فەریسیــیا بریارەک دەرێخستبوو هەر کەسەکێ عیسـای ببینت بلا بێژت دا وی دەستەسەر بکەن.

## پشکا دوازدێ (١٢)

### عیسا ل بێت عەنیا دئێتە روونکرن:

[1] ژ بەری جـەژنا دەربازبوونێ ب شـەش رۆژا عـیـسـا هاتە بێت عـەنـیـا، بازێرێ لەعـازەری ئەوێ ژناڤ مـرییـا راکـرییەڤـە. [2] بۆ وی سـفـرەکـا شـیـڤێ هاتە دانان، و مەرتایێ دەست ب خزمەتێ کر، و لەعازەر ئێک ژ پالدایا بوو ل گـەل وی. [3] و مـەریەمێ منەک (ئانکو ئێک ژ سێ چارێکێت لیترێ) ژ گـولاڤا ناردینا خۆمالی یا بهـا گران هەلگرت و پێت عیـسـای پێ روونکرن و ب پرچا خۆ زوها کـرن، و مـال تژی بێـهـنا خـۆش بوو. [4] ئێکی ژ شـاگـردا گـۆت، ئەو ژی یەهودایێ ئەسـخـەریوتی بوو، ئەوێ دا بێبەختییێ ل عیـسـای کەت: [5] «بوچی ئەڤ گولاڤە نەهاتە فرۆتن ب سێ سەد دینارا ل سەر هەژارا بێتە بەلاڤەکرن؟» [6] و ئەڤە نەگۆت کو ئەوێ دلوڤان بوو ل سەر هەژارا بەلێ چونکو ئەو دز بوو. ئەو خـەزنەدار بوو و ئەوا کـرنە تێـدا ددزی. [7] عـیـسـای بەرسـڤـا وی دا: «بهـێلە: ئەوێ ئەڤ گـولاڤـە یا ل دەڤ خـۆ راکـری بۆ رۆژا ڤـەشـارتنا من.

(٨)چونکو هەژار ل هەمی دەمـــا ل دەڤ هەوە هەنە، بەلێ ئەز هەر ل دەڤ هەوە نابم.»

(٩)و گەلەک ژ جـوهـیـیـا زانـی ئەو یێ ل وێرێ، ڤـێـجـا هاتن نە بەس دا عـیـسـای ب تنێ ببینن بەلکو دا لەعازەرێ ژناڤ مرییا راکری ژی ببینن. (١٠)سەرۆکێت قەشا بریار دا لەعازەری ژی بکوژن، (١١)چونکو گەلەک ژ جوهییا ژبەر وی ئەو دهێلان و باوەری ب عیسای دئینا.

**عیسا ب سەرکەفتنی دچیتە ئورشلیمێ:**

(١٢) و ل رۆژا پاشتر، ئەو جەماوەرێ زۆر هاتی‌یە جەژنێ گوه لێ بوو کو عیسا دێ ئێتە ئورشەلیم. (١٣)ئەوان چقێت دار قەسپێ هەلگرتن و دەرکەفتنە پێشەوازی‌یا وی و کرنە هەوار: «**ئوسـەنا! پیـرۆز بیت ئەوێ ب ناڤێ خـودانی هاتی!**(زەبور ١١٨: ٢٥-٢٦) ئەو پاشـایێ ئیـسـرائیلی‌یە!»

(١٤)عـیـسـای جانەکەرەک دیت و لێ سیار بوو، هەروەکو هاتی‌یە نڤێسین: (١٥) «**ئەی کچا سەهیون نەترسە، پاشایێ تە یێ بەرەڤ تە ڤە دئێت ل جانەکەرەکی سیارە.**»(زەکەریا ٩: ٩)

(١٦) و شـاگـردێت عـیـسـای ل پێـشـیێ نەزانین کو ئەڤـە تەمامەتی‌یا پێغەمبەراتیی‌یە، بەلێ دەمێ عیسا هاتی‌یە مەزنکرن، هاتە بیرا وان کو پەرتوکێ ئەڤ تشتە یێ ل سەر گۆتی و وان ژبەر وی ئەڤ تشتە کر. (١٧)ئەو کۆما ل گەل

وی دەمێ گـازی لەعـازەری کـر ژ گـۆڕی و ژناڤ مـرییـا راکـری، شـەهدەکی بۆ وی ب وێ چەندێ ددا. [١٨] و ژبەر وێ چەندێ کۆم دەرکەفتن بۆ پێشەوازییا وی، چونکو وان گـوه لێ بوو کـو وی ئەو نیـشـان یا کـری. [١٩] ئینا فەریسـیـیا گۆتە ئێکودوو: «هەوە دیت چاوا چو مـفـا نە گـەهشـتـە هەوە؟ ئەها ئەڤـە هەمی دونیـا ب دویڤ وی کەت!»

### عیسا خێڤزانکیێ ب مرنا خۆ دکەت:

[٢٠] و ژناڤ بەرا وان ئەوێت هـاتینە ئورشـەلیم بۆ پەرستنێ د جـەژنێدا هندەک یونانی بوون. [٢١] ئینا چۆنە دەڤ فیلیپسی، و ئەو ژ بێت سەیدایە ل دەڤەرا جەلیل، و گۆتنێ: «ئەز خـولام، مـە دڤـێت ئەم عیـسـای ببینین.» [٢٢] ڤـێجا فیلیپس هات و گۆتە ئەندراوسی، پاشی پێکڤە چۆن و گۆتنە عیسـای. [٢٣] عیـسـای گۆتە وانا: «دەمژمێرا مەزنکرنا کورێ مرۆڤ یا نێـزیک بووی. [٢٤] ب راستی ب راستی ئەز دبێژمە هەوە کو دندکا گەنمی دێ یا ب تنێ بیت هەکـەر نەکـەفـتـە ئەردی و بمریت، بەلێ هەکـەر مـر، دێ گەلەک دندکا دەت. [٢٥] هەچییێ خۆ ب ژیانا خۆڤە بگریت، دێ ژ دەست چیت، و هەکەر حەژێ نەکەت ل ڤێ دونیـایێ، دێ بۆ ژیانا هەر و هەر هەلگریت. [٢٦] هەچییێ خزمـەتا من

بکەت بلا ل دویڤ من بێت، و جهێ ئەز لێ دێ خولامێ من ژی لێ بیت. و هەر کەسەکێ خزمەتا من بکەت دێ بابێ من رێزا وی گریت.

[٢٧]نوکە مەعدێ من یێ تێک چوی‌یە. ڤێجا ئەز چ بێژم؟ «ئەی باب، من ژ وێ دەمژمێرێ قورتال کە» ؟ نە! ژبەر ڤێ دەمژمێرێ ئەز یێ هاتیم. [٢٨]ئەی باب، ناڤێ خوّ مەزن بکە!» پاشی دەنگەک ژ ئەسمانا بەرسڤ دا: «من یێ مەزن کری و دێ مەزن کەم ژی.» [٢٩]هندەک ئامادەبوویا ئەوێت دەنگ گوه لێ بووی گوتن: «ئەڤە دەنگێ بریسی‌یە!» بەلێ هندەکێت دی گوتن: «فریشتەکێ ل گەل ئاخفتی.» [٣٠]عیسای بەرسڤ دا: «ئەڤ دەنگە نە ژبەر من بوو بەلێ ژبەر هەوە بوو. [٣١]نوکە دەمێ دادکرنێ‌یە ل سەر دونیایێ، نوکە دێ میرێ ڤێ دونیایێ ئێتە دەرێخستن بوّ ژ دەرڤە. [٣٢]بەلێ دەمێ ئەز ژ ئەردی دئێمە بلند کرن دێ هەمی مروڤا د گەل خوّ راکێشم.» [٣٣]ئەڤە گوت نیشانا وێ رەنگێ مرنێ ئەوا دێ پێ مریت. [٣٤]ڤێجا ئامادەبوویا گوتن: «دەستوری یا نیشا مە دای کو مەسیح دێ مینتە ساخ هەتاهەتایێ، پا چاوا تو دبێژی کو کورێ مروڤ پێتڤی‌یە بێتە هەلاویستن؟ ئەو کی یە کورێ مروڤ؟» [٣٥]عیسای گوتە وان: «روناهی دێ ل گەل هەوە مینیت بوّ دەمەکێ کورت. ڤێجا هەتا هەوە

رۆناهی هەیە دبەردەوام بن ل سەر چۆنا خۆ، نە کو تاری ب سەر هەوەدا بێت. ئەوێ ل تاریێ دچیت نزانیت دێ کیڤە چیت. [٣٦] هەتا هەوە رۆناهی هەیە باوەریێ ب رۆناهیێ بینن دا ببنە کورێت رۆناهیێ.» و پشتی عیسای ئەڤ چەندە گۆتی چۆ و خۆ ژ وان ڤەشارت.

## بەردەوامیيا جوهییا ل سەر بێ باوەرییا وان:

[٣٧] و ل گەل هندێ کو وی گەلەک نیشان ل بەرامبەری وان کرن، باوەری ب وی نەئینا، [٣٨] داکو گۆتنا ئەشعیا پێغەمبەری تەمام بیت: **«ئەی خودان کێ باوەری ب ئاخفتنا مە ئینا؟ و بۆ کێ دەستێ خودانی دیار بوو؟»** [ئەشعیا ٥٣: ١]

[٣٩] ئەو نەشیان باوەریێ بینن، چونکو ئەشعیای هەروەسا گۆت: [٤٠] **«چاڤێت وان کۆرە کرن و دلێت وان رەق کرن، دا رۆناهیێ ب چاڤێت خۆ نەبینن و ب دلێت خۆ تێ نەگەهن و پەشێمان ببن دا وان ساخ کەم.»** [ئەشعیا ٦: ١٠]

[٤١] ئەشعیای ئەڤ چەندە گۆت دەمێ مەزناهییا خودانی دیتی و ل سەر ئاخفت. [٤٢] و ل گەل هندێ گەلەک ژ سەرۆکێت جوهییا ژی باوەری ب عیسای ئینا، بێی کو باوەرییا خۆ دیار بکەن، داکو ژ جڤاتا کنیشتێ نەئێنە دەرێخستن، [٤٣] چونکو مەزناهی یا ژ مرۆڤا دئێت ب سەر وێ دئێخن ئەوا ژ دەڤ خودێ دئێت.

**عیسا بێ باوەرا هشدار دكەت:**

[٤٤]عـیـسـای ب دەنگەكێ بلند گـۆت: «هەر كـەسێ باوەریێ ب من بینیت، ئەو باوەریێ ب من نائینیت ب تنێ بەلێ ب وی ژی ئەوێ ئەز هنارتیم. [٤٥]و هەچییێ ئەز دیتـیم، ئەوی دبینیت یێ ئەز هنارتیم. [٤٦]ئەزم رۆناهیىیا هاتی‌یە دونیـایێ، داكـو هەچییێ باوەریێ ب من بینیت د تارییێدا نەمینیت. [٤٧]و هەكەر ئێكی گوه ل گۆتنا من بوو و كار پێ نەكر، ئەز وی داد ناكەم، چونكو ئەز نەهاتیمە دا دادكـرنێ ل سەر دونیـایێ بكەم، بەلێ دا دونیـایێ قـورتال كەم. [٤٨]ئەو كـەسێ ئەز نەڤـیم و گـۆتنا من نەوەرگـریت، ئەوی ئێـك یێ هەی وی داد بكەت: ئەو پەیڤا من گـۆتی، ئەو دێ دادكـرنێ ل سـەر كـەتن ل رۆژا دومـاهیێ. [٤٩]چونكو من چو ژ دەڤ خۆ نە گـۆتی‌یە، بەلێ ئەو بابێ ئەز هنارتیم ئەزێ فەرمان كریم كا چ بێژم. [٥٠]و ئەز دزانم كـو فەرمانا وی ژیانا هەروهەرە. ڤـێجا ئەو ئاخفتنا ئەز دبێژم، ئەز وەسا دبێژم هەروەكو بابی گۆتی‌یە من.»

# پشکا سێزدێ (١٣)

**عیسا پێت شاگردا دشۆت:**

[١] ژ بەری جەژنا دەربازبوونێ، عیسای دزانی کو دەمێ وی هات دا ژ ڤێ دونیایێ بار کەت و بچیتە دەڤ بابی. هکەر وی حەژ تایبەتمەندێت خۆ یێت ل دونیایێ کربیت، ئێدی بێ قەدەر حەژ وان دکەت. [٢] و دەمێ شیڤێ، ئبلیسی کربوو د دلێ یەهودا یێ کورێ شەمعونێ ئەسخەریوتی داکو بێبەختییێ ل عیسای بکەت. [٣] و عیسای دزانی کو بابی هەمی تشت یێت کرینە د دەستێت وی‌دا و ئەو یێ ژ خودێ دەرکەفتی و بۆ خودێ دێ ڤەگەڕیتە ڤە. [٤] ژسەر مێزا شیڤێ رابوو، و کورکێ خۆ ژبەر خۆ کر و دەستمالەک ل ناڤتەنگا خۆ شداند، [٥] پاشی ئاڤ کرە ئامانەکێ بۆ شوشتنێ، و دەست پێ کر پێت شاگردا شوشتن و ب وێ دەستمالا ل ناڤتەنگا خۆ شداندی زوها کرن. [٦] دەمێ گەهشتییە شەمعونێ پەتروسی، گۆتێ: «ئەی خودان، تو پێت من دشۆی؟» [٧] عیسای بەرسڤا وی دا: «ئەو کارێ ئەز دکەم تو نۆکە تێ ناگەهی، بەلێ پاشی دێ تێگەهی.» [٨] بەلێ پەتروس رشت بوو و گۆت: «نە، تو قەت پێت من ناشۆی!» عیسای بەرسڤا وی دا: «هەکەر ئەز تە نەشۆم تە چو بەهر

ل گەل من نابیت!» [٩] شەمعون پەتروسی گۆتە وی: «ئەی خـودان، نە پێت من ب تنێ، بەلێ دەست و سـەرێ من ژی!» [١٠] عـیـسـای گـۆت: «هەر کـەسێ خـۆ شـوشـتی هەمی‌یێ پاقژ بووی، بەس پێتـڤی‌یە پێت خـۆ بشۆت. و هوین پاقـژن، بەلێ نە هوین هەمی.» [١١] عـیـسـای دزانی کی دێ بێبەختیێ لێ کەت، و ژبەر هندێ گۆت: «نە هوین هەمی دپاقـژن.» [١٢] و دەمێ ژ شـوشـتـنا پێت وان ب دوماهی هاتی، کورکێ خۆ کرە بەر خۆ و زڤری جهێ خۆ، و پسـیـار ژ وان کـر: «هوین تێ گەهشتن من چ بۆ هەوە کـر؟ [١٣] هوین دبێـژنە من مـامـۆسـتـا و خـودان، هەوە راست گۆت، ئەز ژی وەسامە. [١٤] هەکەر ئەز خودان و مامـۆستا بم، و من پێت هەوە شوشتن، ل سەر هەوەیە ژی هەر ئێک ژ هەوە پێت یێ دی بشۆت. [١٥] من بۆ هەوە نموونەک ئینا دا هوین وە بکەن وەکـو من ل هەوە کـری. [١٦] ب راسـتی ب راستی ئەز بۆ هەوە دبێژم: کویلە ژ خودانێ خۆ نە مەزنترە، و چو هنارتی مەزنتـر نینە ژ ئەوێ ئەو هنارتی. [١٧] هەکـەر هەوە ئەڤ چەندە زانیبت، خنێـکێت هەوە هەکەر هەوە کـار پێ کربیت. [١٨] و ئەز ڤێ نابێژم دەربارەی هەوە هەمـیـیـا، ئەز دنیاسم ئەوێت من هەلبژارتین. بەلێ دڤێت پەرتوک ب جهـ بێت دەمێ دبێژیت: **ئەوێ ژ نانێ من خواری، پەحنی‌یا خـۆ ل من راکـر.** (زەبور ٤١: ٩) [١٩] و ئەز دێ بێـژمـە هەوە دێ چ

روی دەت، بەری رویدانا وی، داکـــــو دەمێ روی ددەت هینگێ هوین دێ باوەر کەن کو ئەز ئەوم. [٢٠] ب راستی ب راستی ئەز دبێژمە هەوە، هەر کەسێ قـائیل بیت ب وی ئەوێ ئەز دهنێـرم ب من قـائیل دبیت، و هەچیێ ب من قائیل بیت، ب ئەوێ ئەز هنارتیم.»

## عیسا پێشبینیـیا سپارتنا خۆ دکەت:

[٢١] دەمێ عیسای ئەڤ چەندە گۆتی ئەو تەنگاڤ بوو و شـەهدەکی دا و گـۆت: «ب راستـی ب راستـی ئەز بۆ هەوە دبێـژم: ئێک ژ هەوە دێ بێـبەختـیێ ل من کـەت!» [٢٢] و شاگرد گوهشین و بەرێ خۆ دانە ئێکودوو و ئەوان نەدزانی بەحسـا کێ دکەت. [٢٣] و ئەو شاگردێ عیسای حەژێ دکر پالا خـۆ دا بوو سـینگێ وی. [٢٤] شـەمـعـون پەترۆسی نیشـانەک داێ کو پسیـار کەت ئەو بەحسـا کێ دکەت. [٢٥] خۆ خارکرە سەر سینگێ عیسای و پسیار ژێ کر: «ئەو کی یە، ئەی خودان؟» [٢٦] عـیـسـای بەرسڤ دا: «ئەو ئەوە ئەوێ ئەز پاریێ تێ دهەلینم و ددەمێ.» پاشی پاری تێ هەلاند و دا یەهودایێ کـورێ شـەمـعـونێ ئەسـخەریوتی. [٢٧] پشتی پاری، ئبلیس چۆ دناڤ ویدا و عـیـسـای گـۆتە وی: «ب لەز وێ بکە ئەوا تە دڤیـا بکەی!» [٢٨] و کەس ژ جـڤـاتێ تێ نەگـەهشت ژبەر چ ئەڤ چەندە گـۆتە وی،

[٢٩] بەلێ هندەک ژ وان هزر کر ئەو فەرمانا وی دکەت کو پێتڤی‌یێت وان بیێت جەژنێ بکرت یان هندەک پارا بدەتە هەژارا، چونکو ئەو دەستخزنەدار بوو. [٣٠] و چاوا یەهودای پاری وەرگرتی و کریە د دەڤێ خوّدا دەرکەفت. و ئەو دەم شەڤ بوو.

**شیرەتا نوی:**

[٣١] دەمێ یەهودا دەرکەفتی عیسای گوّت: «نوکە کورێ مروّڤ مەزن بوو و خودێ ژی دناڤ وی‌دا مەزن بوو، [٣٢] و هەکەر خودێ دناڤ‌دا مەزن بوو، ئەو دێ وی دناڤ خوّدا مەزن کەت، و دێ ب لەز مەزن کەت. [٣٣] ئەی بچویکێت من، ئەز دێ دەمەکێ کورت ل گەل هەوە مینم، و پاشی دێ من داخواز کەن بەلێ دێ وێ بێژمە هەوە ئەوا من ژ بەری هینگێ گوّتی‌یە جوهییا: هوین نەشێن بێنە وی جهێ ئەز دچمێ. [٣٤] ئەز دێ شیرەتەکا نوی ل هەوە کەم: حەژ ئێکودوو بکەن، هەروەکو من حەژ هەوە کری، دڤێت هوین حەژ ئێکودوو بکەن. [٣٥] و ب ڤێ چەندێ خەلک هەمی دێ زانن هوین شاگردێت منن: هەکەر هوین حەژ ئێکودوو بکەن.»

**عیسا دزانیت کو پەتروس دێ وی نەنیاس کەت:**

[٣٦]ئینا شەمعون پەتروسی گۆتێ: «ئەی خودان دێ کیڤە چی؟» عیسای بەرسڤ دا: «نوکە تو نەشێی بێیە وی جهێ ئەز دچمێ بەلێ تو دێ پاشی ل دویڤ من ئێی.» [٣٧]پەتروسی گۆتێ: «ئەی خودان، بۆچی ئەز نەشێم نۆکە ل دویڤ تە بێم؟ ئەز دێ ژیانا خۆ گۆری تە کەم.» [٣٨]عیسای بەرسڤ دا: «ئەرێ تو دێ ژیانا خۆ گۆری من کەی؟ ب راستی ب راستی دبێژمە تە: ژ بەری دیکل بانگ بدەت تو دێ سێ جارا من نەنیاس کەی.»

# پشکا چاردێ (١٤)

**رێک و راستی و ژیان:**

[١] «دلێت هەوە بلا تێک نەچن: هوین باوەریێ ب خودێ دئینن، باوەریێ ب من ژی بینن. [٢]د مالا بابێ من‌دا گەلەک مەزەلێت هەین، هەکەر وەسا نەبا ئەز دا بێژمە هەوە! ئەز دێ چم دا بۆ هەوە جهەکی ئامادە بکەم. [٣]و پشتی ئەز دچم و بۆ هەوە جهی تەرخان دکەم دێ زڤرم و هەوە بۆ خۆ بەم دا ل وی جهی بن ئەوێ ئەز لێ. [٤]هوین دزانن ئەز دێ کیڤە چم، و هوین رێکێ دزانن.»

[٥]ئینا تومای گۆت: «ئەی خودان، ئەم نزانین دێ تو کیڤە چی، پا دێ چاوا رێکێ زانین؟» [٦]ئینا عیسای بەرسڤ دا: «ئەزم رێک و راستی و ژیان. کەس ناگەهتە بابی هەکەر ب من نەبیت. [٧]هەکەر هەوە ئەز نیاسیبم، هەوە بابێ من ژی یێ نیاسە. و ژ ڤێ گاڤێ پێدا هوین دنیاسن و هەوە یێ دیتی.» [٨]ئینا فیلیپسی گۆتێ: «ئەی خودان، بابی نیشا مە بدە و ئەو بەسی مەیە.» [٩]ئینا عیسای بەرسڤا وی دا: «ئەڤ دەمێ درێژ بوری و ئەز یێ ل گەل هەوە و هێشتا تە ئەز نەنیاسیمە، ئەی فیلیپس؟ ئەوێ ئەز دیتیم باب ژی یێ دیتی. چاوا تو دبێژیە من: «بابی نیشا مە بدە؟» [١٠]تو باوەریێ نائینی کو ئەز یێ د بابیدا، و باب یێ د مندا؟ ئەو پەیڤێت ئەز دبێژمە هەوە ئەز ژ دەڤ خۆ نابێژم، بەلێ ئەو بابێ دناڤ مندا ئەو یێ کارێت خۆ دکەت. [١١]گۆتنا من باوەر کەن کو ئەز یێ د بابیدا و باب یێ دناڤ مندا، و هەکەر نە، باوەریێ ب من بینن ژبەر وان کارا. [١٢]ب راستی ب راستی ئەز دبێژمە هەوە یێ باوەریێ ب من بینیت دێ وان کارا کەت یێت ئەز دکەم، و دێ ژ وان مەزنتر کەت، چونکو ئەز دێ چمە دەڤ بابێ خۆ. [١٣]و هوین چ تشتێ ب ناڤێ من داخواز کەن دێ وە کەم، داکو باب د کوریدا بێتە

مـەزنکرن. [١٤] هەکـەر هەوە هەر تشـتـەک ب ناڤێ من داخواز کر، ئەز دێ کەم.»

**سوز ب روحا پیروز:**

[١٥] «هەکەر هەوە ئەز دڤێتم، ب شیـرەتێت من بکەن. [١٦] و ئەز دێ ژ بابی داخواز کەم کو هاریکارەکێ دی بدەتە هەوە داکـو بمینتـە دگـەل هەوە هەتا هەتاییێ، [١٧] ئەو ژی روحا راستییێیە، ئەوێ دونیا نەشێت قەبیل کەت چونکو نابینیت و نانیاسیت، بەلێ هوین دنیاسن چونکو ئەو یێ دناڤ بەرا هەوەدا، و دێ دناڤ هەوەدا بیت. [١٨] ئەز هەوە ناهێلم بێ دای و باب، و دێ بۆ هەوە ڤـەگـەڕمـە ڤـە. [١٩] پشـتی چەندەکا دی دونیـا من نابینیت، بەلێ هوین دێ من بینن، و چونکو ئەز یێ سـاخم، هوین ژی دێ ژین. [٢٠] د وێ ڕۆژێدا هوین دێ زانن کو ئەز یێ د بابێ خودا، و هـوین یـێ دناڤ مـندا، و ئـەز یـێ د هـەوەدا. [٢١] ئەوێ شیرەتێت من دگەل، و پێ بکەت، ئەوی ئەز خۆش دڤێتم. و ئەوێ ئەز خۆش بڤێتم، بابێ من ژی خۆش دڤێت، و من ژی خۆش دڤـێت و خـۆ بۆ ئاشکرا دکـەم.» [٢٢] ئینا یەهودایێ - نە ئەسخەریوتی - پسیار ژێ کر: «ئەی خـودان، ئەو چ بوویە کـو تو خـۆ بۆ مـە ئاشکرا کەی و نە بۆ دونیـاییێ؟» [٢٣] ئینا عـیـسـای بەرسڤ دا: «ئەوێ ئەز خۆش بڤـێم دێ

ب پەیڤا من کەت، و دێ بابێ من ئەو خۆش ڤێت، و دێ بەرەڤ وی چین، و ل دەڤ وی دێ جهێ خۆ دانین. [٢٤] و ئەوێ ئەز نەڤێم ب خەبەرێ من ناکەت. و ئەڤ پەیڤا هوین ژ من گوهـ لێ دبن نە ژ دەڤ منە، بەلێ ژ دەڤ بابێیە ئەوێ ئەز هنارتیم.

[٢٥] و من ئەڤ تشت گۆتنە هەوە و ئەز هێش یێ ل دەڤ هەوە، [٢٦] بەلێ هاریکار، روحا پیرۆز، ئەوێ کو باب دێ ب ناڤێ من ڤرێ کەت، ئەو دێ هەوە فێری هەمی تشتا کەت، و دێ هەمی تشتێت من گۆتینە هەوە نیننە بیرا هەوە. [٢٧] ئاشتییێ دێ بۆ هەوە هێلم، ئاشتی‌یا خۆ دێ دەمە هەوە. نە هەروەکو دونیا ددەت ئەز دێ دەمە هەوە. تەنگاڤ نەبن و نەترسن. [٢٨] هەوە گوهـ لێ بوو من گۆتە هەوە: ئەز دێ ژ دەڤ هەوە چم و پاشی دێ ڤەگەرمە ڤە. ڤێجا هەکەر هەوە ئەز خۆش ڤیابام، دا هوین دلخۆش بن چونکو ئەز دێ چمە دەڤ بابی، چونکو باب ژ من مەزنترە. [٢٩] ئەها ئەڤە من ئەو تشت گۆتە هەوە ژ بەری روی بدەت، داکو دەمێ روی ددەت هوین باوەریێ بینن. [٣٠] نێدی ئەز گەلەک ل گەل هەوە نائاخڤم. چونکو میرێ ڤێ دونیایێ یێ بەرەڤ منڤە دئێتن، و وی چو دەستهەلاتی ل سەر نینە. [٣١] بەلێ دا دونیا بزانیت کو من باب خۆش دڤێت، و هەروەکو بابی ئەز فەرمان کریمە

ئەز وەسا دكەم.
رابن، دا ژ ڤێرێ بچین!»

# پشكا پازدێ (١٥)

**مێوا دروست:**

[١] «ئەزم مێوا دروست و بابێ من رەزڤانە. [٢] هەچی چقێ ژ من بیت و فێقی نەدەت دێ بڕیت، و چ چقێ فێقی بدەت پاقژ دكەت داكو پتر بەری بدەت. [٣] هوین پاقژن ژبەر وێ پەیڤا من هوین پێ گوتار كرین. [٤] ڤێجا هوین دناڤ مندا بمینن و ئەز دناڤ هەوەدا. هەروەكو چق بەرهەمی نادەت هەكەر نە دناڤ مێوێدا بیت، هەروەسا هوین ژی هەكەر دناڤ مندا نەبن. [٥] ئەزم مێو و هوین چقن. هەچیێ دناڤ مندا بمینیت و ئەز دناڤ ویدا دێ ئەو بەرهەمەكێ زۆر دەت، چونكو هوین بێی من نەشێن تشتەكی بكەن. [٦] هەچیێ دناڤ مندا نەمینیت دێ ئێتە هاڤێتن ژ دەرڤە وەكو چقی و دێ هشك بیت و پاشی دێ چقێت هشك ئێنە كۆم كرن و دێ ئێنە هاڤێتن دناڤ ئاگریدا و ئێنە سۆتن. [٧] بەلێ هەكەر هوین دناڤ مندا مان و پەیڤا من دناڤ هەوەدا ما، هوین وێ بخوازن یا هەوە دڤێت، و دێ بۆ هەوە ب جهـ ئێت. [٨] ب ڤێ چەندێ

بابێ من مەزن دبیت: هوین گەلەک فێقی بدەن و دێ ببنە شاگردێت من. [٩]کا چاوا بابی حەژ من کر، من وەسا حەژ هەوە کر. دناڤ ڤیانا مندا بمینن. [١٠]هەکەر هەوە شیرەتێت من پاراستن، دێ دناڤ ڤیانا مندا مینن، هەروەکو من ب شیرەتا بابێ خۆ کری و دناڤ ڤیانا ویدا دمینم. [١١]من ئەڤە گۆتە هەوە داکو دلخۆشییا من ب هەوە بیت و دلخۆشییا هەوە بێ کێماتی بیت. [١٢]شیرەتا من بۆ هەوە ئەڤەیە: هوین حەژ ئێکودوو بکەن هەروەکو من حەژ هەوە کری. [١٣]چو ژ ڤێ ڤیانێ مەزنتر نینە کو ئێک ژیانا خۆ گۆری خۆشتڤییێت خۆ بکەت. [١٤]و هوین خۆشتڤییێت منن هەکەر هەوە ب شیرەتێت من کر. [١٥]ئێدی ئەز نابێژمە هەوە کویلە، چونکو هندی کویلەیە، مەزنێ وی کریارێت خۆ نیشا وی نادەت. بەلێ من ناڤێ هەوە کرە خۆشتڤی، چونکو هەچییا من ژ بابێ خۆ گوه لێ بووی، من نیشا هەوە دا. [١٦]نە هەوە ئەز هەلبژارتم، بەلێ من هوین هەلبژارتن و من هوین دەستنیشان کرن داکو هوین بچن بەری بدەن و بەرێ هەوە بمینیت. و هەچییا هوین ب ناڤێ من بخوازن دێ باب دەتە هەوە. [١٧]شیرەتا من ژ بۆ هەوە: هوین حەژ ئێکودوو بکەن.»

## دونیا نەحەزییا عیسای و شاگردێت وی دکەت:

[١٨] «هەکەر دونیاییێ نەحەزییا هەوە کر، هوین بزانن ژ بەری هەوە ئەوێ نەحەزییا من یا کری. [١٩] هەکەر هوین ژ دونیاییێ بان، دا دونیا حەژ خەلکێ خۆ کەت. بەلێ چونکو هوین نە ژ دونیاییێنە، بەلێ من هوین ژ ڤێ دونیاییێ هەلبژارتین، ژبەر هندێ دونیا نەحەزییا هەوە دکەت. [٢٠] وێ پەیڤێ بیننە بیرا خۆ دەمێ من گۆتییە هەوە: چو کویلە نینن ژ مەزنێ خۆ مەزنتر. هەکەر خەلکێ دونیاییێ ئەز تەنگاڤ کریم، ئەو دێ هەوە ژی تەنگاڤ کەن و هەکەر ب پەیڤا من کرین، دێ ب پەیڤا هەوە ژی کەن. [٢١] بەلێ ئەو دێ ڤێ چەندێ هەمییێ ل هەوە کەن ژبەر ناڤێ من، چونکو ئەو وی نانیاسن ئەوێ ئەز هنارتیم. [٢٢] هەکەر ئەز نەهاتبام و ل گەل وان نەئاخفتبام، دا بێ گونەهـ بن، بەلێ ڤێ گاڤێ ئەوان چو هێجەت د گونەهێن خۆدا نینە. [٢٣] ئەوێ نەحەزییا من دکەت، ئەو نەحەزییا بابێ من ژی دکەت. [٢٤] و هەکەر من دناڤبەرا واندا هندەک کار نەکربان یێت کەسێ ژبلی من نەکرین، ئەو دا دبێ گونەهـ بن. بەلێ ئەوان نەحەزییا من و بابێ من کر و هەرچەندە ئەوان ئەو کارە دیتن. [٢٥] و ئەو چەند چێبوو داکو ئەو پەیڤا

د دەستورێ واندا نڤیٚسی بیٚتە جهـ: **بێ ئەگەر نەحەزییا من کرن.** [زەبور ٣٥ ١٩ و ٦٩ ٤]

## عیسا شاگردیٚت خۆ بەرهەڤ دکەت ژ بۆ خاتر خواستنێ:

[٢٦] و دەمێ هاریکار دئیٚتن، ئەوێ ئەز دێ بۆ هەوە ژ دەڤ بابی هنیٚرم، روحا راستییێ ئەوا ژ بابی دەردکەڤیت، ئەوە دێ بۆ من شەهدەکییێ دەت. [٢٧] و هوین ژی دێ بۆ من شەهدەکییێ دەن، چونکو هوین هەر ژ دەستپیٚکێ ل گەل منن.»

## پشکا شازدێ (١٦)

[١] «من ئەڤ چەندە گۆتە هەوە دا هوین ژ جهـ نەلڤن. [٢] هوین دێ بۆ ژ دەرڤەی کنیشتا ئیٚنە دەریٚخستن. و دێ دەمەک ئیٚتن هەچییێ هەوە بکوژیت دێ هزر کەت یێ خزمەتەکێ بۆ خودێ دکەت. [٣] و ئەو وێ چەندێ دێ ل هەوە کەن چونکو بابێ من نانیاسن و ئەز ژی نەنیاسیم. [٤] بەلێ من ئەڤ چەندە بۆ هەوە گۆت داکو دەمێ رویدانا وێ دئیٚت بیٚتە بیرا هەوە کو ژ بەری هینگێ من یێ گۆتییە هەوە. و من ئەڤ چەندە هیٚشتا ژ دەستپیٚکێ نەگۆتە هەوە چونکو ئەز ل گەل هەوە بووم. [٥] بەلێ ڤێ

گاڤێ ئەز دێ بۆ وی ڤەگەڕێیم ئەوێ ئەز هنارتیم و کەس ژ هەوە پسیارێ ژ من ناکەت: «دێ کیڤە چی؟» [6] ژ بەر کو من ئەڤ چەندە گۆتی‌یە هەوە، دلێ هەوە تژی مریتویی بوو. [7] بەلێ ئەز راستیێ بۆ هەوە دبێژم: بۆ هەوە باشترە ئەز بچم چونکو هەکەر ئەز نەچم هاریکار بۆ هەوە نائێت بەلێ هەکەر ئەز چۆم دێ بۆ هەوە هنێرم. [8] و دەمێ دئێت دێ گونەهێ، دادپەروەری و دادکرنا دونیایێ دیار کەت. [9] دەربارەی گونەهێ چونکو ئەو باوەریێ ب من نائینن، [10] و دەربارەی دادپەروەریێ چونکو ئەز دێ چمە دەڤ بابی و ئێدی هوین من نابینن، [11] و دەربارەی دادکرنێ چونکو میرێ ڤێ دونیایێ هاتە حوکم کرن.

[12] هێشتا من گەلەک تشت یێت هەین بۆ هەوە بێژم، بەلێ ڤێ گاڤێ هوین نەشێن خۆ ل بەر بگرن. [13] بەلێ دەمێ ئەو، روحا راستیێ، دئێت، دێ بەرێ هەوە دەتە هەمی راستیێ، چونکو چو تشتی ژ دەڤ خۆ نابێژیت بەلێ دێ وێ بێژیتە هەوە یا ئەو گوهـ لێ دبیت و دێ وێ بێژتە هەوە ئەوا ل پاشەڕۆژێ بێتە رویدان. [14] و ئەو دێ من مەزن کەت چونکو ژ دەڤ منە هەچی‌یا بۆ هەوە دبێژیت. [15] هەچی تشتێ بابی یێ منە و ژبەر هندێ من گۆتە هەوە ئەوا دبێژتە هەوە ژ دەڤ منە.

[16] پشتی دەمەکێ کورت هوین من نابینن و پشتی

دەمەکێ کورت دێ من بینن.» [١٧] ئینا هندەک شاگردا پسیار ژ ئێکودوو کر: «ئەرێ رامانا گۆتنا وی چی یە، «پشتی دەمەکێ کورت هوین من نابینن و پشتی دەمەکێ کورت دێ من بینن،» و هەروەسا: «چونکو ئەز دێ بۆ بابی ڤەگەرێیم» ؟» [١٨] و گۆتن: «ئەو چ دەمێ کورتە، ئەوێ ئەو بەحس دکەت؟ ئەم تێ ناگەهین چ دبێژیت.» [١٩] و عیسای زانی ئەوان دڤێت پسیارێ ژێ بکەن، ئینا گۆتە وان: «هوین پسیارێ دکەن رامانا گۆتنا من چی یە ئەڤا دبێژیت: پشتی دەمەکێ کورت هوین من نابینن و پشتی دەمەکێ کورت دێ من بینن؟ [٢٠] ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە: هوین دێ گرین و لورینن بەلێ دونیا دێ دلخۆش بیت، هوین دێ خەمگین بن بەلێ خەمگینییا هەوە دێ بتە خۆشی. [٢١] ژنک مریتو دبیت وەختێ دبیتە دەمێ بچویکبوونا وێ، بەلێ دەمێ بچویک دبیت، زەحمەتا وێ ژ بیرێ دچیت چونکو دلخۆش دبیت مرۆڤەک هاتە دونیایێ. [٢٢] ڤێجا هوین ژی نۆکە دێ مریتو بن، بەلێ ئەز دێ هەوە بینمە ڤە، و دێ دلێت هەوە گەش بن و کەس دلخۆشییا هەوە ژ هەوە ناستینیت. [٢٣] و د وێ رۆژێدا پسیارا چو تشتی ژ من ناکەن. ب راستی ب راستی دبێژمە هەوە: هەچی تشتێ هوین ب ناڤێ من ژێ بخوازین دێ باب دەتە هەوە. [٢٤] هەتا نۆکە هەوە چو تشت ب ناڤێ

من نەخواستی‌یە. هوین بخوازن دێ ب دەست هەوەڤە ئێت و دلخۆشی‌یا هەوە دێ دروست بیت.

[٢٥] ئەز د ئاخفتنا خۆدا بۆ هەوە ب نموونە ئاخفتیم، بەلێ دێ دەم ئێت بۆ هەوە ب نموونە نائاخڤم بەلێ دێ ب ئاشکرایی بەحسا بابی کەم. [٢٦] هوین دێ ل وێ رۆژێ ب ناڤێ من داخوازێ ژ بابی کەن و ئەز نابێژمە هەوە ئەز دێ پێش هەوەڤە داخوازێ کەم، [٢٧] باب ب خۆ حەژ هەوە دکەت چونکو هەوە حەژ من کر و هەوە باوەری ئینا ئەز ژ دەڤ خودێ یێ دەرکەفتیم. [٢٨] ئەز ژ دەڤ بابی دەرکەفتیم و ئەز هاتمە دونیایێ، و نەڤە ئەز دێ دونیایێ هێلم و بۆ بابی ڤەگەرییێم.» [٢٩] ئینا شاگردێت وی گۆتنێ: «نەڤە نۆکە تو یێ ب ئاشکرایی دگەل مە دئاخڤی و بێ نموونە، [٣٠] نۆکە ئەم دزانین تو هەمی تشتی دزانی و پێ نەڤێت کەس پسیارێ ژ تە بکەت، ژبەر هندێ ئەم باوەرییێ دئینین تو ژ دەڤ خودێ یێ هاتی.» [٣١] ئینا عیسای بەرسڤ دا: «ئەرێ هوین ژ نوی باوەرییێ دئینن؟ [٣٢] دێ دەمەک ئێتن و نەڤە ئەو دەمە یێ هاتی، هوین دێ بەلاڤە بن و هەر ئێک چتە مالا خۆ و دێ من ب تنێ هێلن، بەلێ ئەز ب تنێ نینم چونکو باب ل گەل منە. [٣٣] من نەڤە هەمی بۆ هەوە گۆت دا هەوە ئاشتی دناڤ مندا هەبیت. هوین دێ تەنگاڤیێ د دونیایێدا بینن، بەلێ خۆ زیرەک بکەن، من

سەرکەفتن ل سەر دونیایێ ئینا.»

## پشکا هەڤدێ (١٧)

**مەسیح نڤێژێ دکەت:**

[١] دەمێ عیسای ئەڤ ئاخفتنە ب دوماهی ئینای چاڤێت خۆ بەرەڤ ئەسمانیڤە بلند کرن و گۆت: «ئەی باب، وەختە، کورێ خۆ مەزن کە، دا کورێ تە ژی تە مەزن کەت، [٢] کو تە یێ دەستهەلاتدار کری ل سەر هەمی خەلکی، دا ژیانا هەروهەر بدەتە هەرکەسێ تە دایێ. [٣] و ژیانا هەروهەر ئەوە کو تە بنیاسن، و هەر توی خودێ یێ راست، و عیسایێ مەسیح ئەوێ تە هنارتی ژی بنیاسن. [٤] من تو ل سەر ئەردی مەزن کری، و ئەو کارێ تە ئەز پێ دەستنیشان کریم من ب جە ئینا. [٥] ڤێجا تو من د حوزیرا خۆدا مەزن کە ئەی باب، ب وێ مەزناهییا من ل دەڤ تە هەی بەری چێکرنا دونیایێ.

[٦] من ناڤێ تە دیار کر بۆ وان مروڤا تە دانە من ژ دونیایێ. یێت تە بوون و تە دانە من، و ب پەیڤا تە کار کرن. [٧] و نۆکە وان زانی هەر تشتێ تە دایە من ژ دەڤ تەیە. [٨] چونکو من فەرمانێت تە ئەز پێ فەرمان کریم بۆ وان ڤەگوهاستن و وان وەرگرتن و ب راستی زانین کو ئەز ژ

دەڤ تە یێ دەرکەفتیم، و باوەری ئینا کو تە ئەز یێ هنارتیم. [٩] ژبەر ڤان ئەز نڤێژێ بۆ تە دکەم، ئەز ژبەر دونیایێ نڤێژێ ناکەم بەلێ ژبەر وان ئەوێت تە داینە من چونکو یێت تەنە. [١٠] و هەر تشتێ من یێ تەیە، و هەر تشتێ تە یێ منە، و ئەز یێ د واندا مەزن بوویم. [١١] ئەڤە دێ ل دونیایێ مینن، بەلێ ئەز لێ نامینم، چونکو دێ بۆ تە ڤەگەڕیێم. ئەی بابێ پیرۆز وانا ب ناڤێ خۆ بپارێزە ب ئەو ناڤێ ئەوێ تە دایە من، دا ببنە ئێک هەروەکو ئەم ئێک. [١٢] دەمێ ئەز ل گەل وان بووم، من ئەو ب وی ناڤێ تە دایە من پاراستن و من چاڤێ خۆ دایێ و کەسەک ژ وان ئەبریا ژبلی کوڕێ براندنێ دا پەرتوک تەمام بیت. [١٣] بەلێ نۆکە ئەز دێ بۆ تە ڤەگەڕیێم، و ئەز ب ڤێ دئاخڤم و ئەز هێش یێ ل دونیایێ، دا کەیفخۆشییا من د واندا تەمام بیت. [١٤] پەیڤا تە من گەهاندە وان، ئینا دونیایێ ئەحەزییا وان کر چونکو ئەو نە ژ دونیایێنە، هەروەکو ئەز نە ژ ڤێ دونیایێ. [١٥] و ئەز داخوازێ ژ تە ناکەم کو تو وان ژ دونیایێ ببەی، بەلێ تو وان ژ یێ چەوت بپارێزی. [١٦] ئەو نە ژ دونیایێنە هەروەکو ئەز ژی نە ژ دونیایێمە. [١٧] ب راستییێ وان پیرۆز کە، پەیڤا تەیە راستی. [١٨] هەروەکو تە ئەز بۆ دونیایێ هنارتیم، من ژی ئەو بۆ وێ هنارتن، [١٩] و ژبەر

وانا ئەز خۆ پیرۆز دکەم، دا ئەو ژی د راستیێدا بێنە پیرۆز کرن.

[٢٠] و ئەز نە ژبەر ڤان ب تنێ نڤێژێ دکەم، بەلێ ژبەر وان ژی ئەوێت دێ ب پەیڤا ڤان باوەریێ ب من ئینن، [٢١] بلا هەمی ببنە ئێک، ئەی باب، هەروەکو تو دناڤ مندا و ئەز دناڤ تەدا، بلا ئەو ژی ئێک ژ مە بن، دا دونیا باوەریێ بینیت کو تە ئەز یێ هنارتیم. [٢٢] ئەو مەزناهی‌یا تە دایە من، من دا وان، دا ببنە ئێک هەروەکو ئەم ئێک، [٢٣] ئەز یێ د واندا، و تو یێ د مندا، دا ب تەمامی ببنە ئێک، هەتا دونیا بزانیت کو تە ئەز یێ هنارتیم و تە ئەو ڤیان هەروەکو تە ئەز ڤیایم. [٢٤] ئەی باب، من دڤێت کو ئەوێت تە داینە من ل گەل من بن وێ جهێ ئەز لێ بم، دا مەزناهی‌یا من ببینن ئەوا تە دایە من، چونکو تە ژ بەری چێکرنا دونیایێ حەژ من کر. [٢٥] ئەی بابێ راست و دروست، دونیایێ تو نەنیاسی، بەلێ من تو نیاسی، و ڤان زانی کو تە ئەز یێ هنارتیم. [٢٦] من ناڤێ تە ب وان دایە نیاسین و دێ دەم نیاسین، داکو ئەو ڤیانا تە ئەز پێ ڤییام دناڤ واندا بیت و ئەز ژی دناڤ واندا بم.»

# پشکا هەژدێ (١٨)

## گرتنا عیسای:

[١] پشتی عیسای ئڤێژا خۆ ب دوماهیک ئینای، د گەل شاگردێت خۆ دەرکەفت و ل نهالا قەدرون دەرباز بوون و رەزەک ل وێرێ هەبوو و ئەو و شاگردێت خۆ چۆنە د رەزیدا. [٢] و یەهودا، ئەوێ بێبەختی لێ کری، ب وی جهی دزانی، چونکو گەلەک جارا عیسا د گەل شاگردێت خۆ ل وێرێ کۆم دبوو. [٣] ڤێجا یەهودا چۆ وێرێ و تیپەکا لەشکەری و نوبەدارێت پەرستگەهێ دگەل خۆ برن ئەوێت سەرۆکێت قەشا و فەریسییا هنارتین و وان خەتیر و چرا و چەکێ خۆ هەلگرتبوون. [٤] عیسای ب هەمی تشتا دزانی ئەوێت دێ ب سەرێ وی ئێن، ڤێجا بەرەڤ وان چۆ و گۆت: «هەوە کی دڤێت؟» [٥] بەرسڤ دا: «عیسایێ ناسری.» گۆتە وان: «ئەز ئەوم.» و یەهودا ئەوێ بێبەختی لێ کری ل گەل وان یێ راوەستای بوو. [٦] و دەمێ گۆتییە وان «ئەز ئەوم،» ل پشت خۆ زڤرین و کەتنە ئەردی. [٧] عیسای جارەکا دی پسیار ژ وان کر: «هەوە کی دڤێت؟» وان بەرسڤ دا: «عیسایێ ناسری.» [٨] عیسای گۆت: «من گۆتە هەوە: ئەز ئەوم. و هەکەر هەوە ئەز دڤێم بهێلن دا ئەڤە بچن.» [٩] ئەڤێ روی دا داکو ئەو پەیڤا

وی گۆتی ب جه بێت: «ئەوێت تە داینە من ئێک ژ وان وێران نابت.» [10] پاشی شەمعون پەتروسی شیرێ خۆ دەرئێخست و دانا کویلێ سەرۆکێ قەشا و گوهێ وی یێ راستی ژێ ڤەکر. و ناڤێ وی کویلەی مەلخوس بوو. [11] عیسای گۆتە پەتروسی: «شیرێ خۆ بکە د کاڤلانیدا! ئەرێ ئەو پەرداغا بابی دایە من ما نەڤەخۆم؟»

**برنا عیسای بۆ نک حەننانی:**

[12] ڤێجا تیپا لەشکەری و سەرۆکێت وان و نوبەدارێت پەرستگەهێ عیسا گرتن و گرێدان [13] و ل پێشیێ برنە نک حەننانی خەزیرێ قیافای سەرۆکێ قەشا ل وێ سالێ. [14] قیافا ئەو بوو ئەوێ گۆتی چێترە زەلامەک بمریت ل پێخەمەتی مللەتی.

**پەتروس خۆ ل عیسای ناکەتە ناس:**

[15] و شەمعون پەتروس و شاگردێ دی ل دویڤ عیسای دچۆن و ئەو شاگرد ل نک سەرۆکێ قەشا یێ نیاس بوو و دگەل عیسای چۆ د مالا سەرۆکێ قەشاڤە، [16] بەلێ پەتروس ژ دەرڤە ما راوەستای. و ئەو شاگردێ دی ئەوێ سەرۆکێ قەشا دنیاسی، دەرکەفت و دگەل خوداما بەر دەرگەهی ئاخفت و پەتروس کرە د ژۆرڤە. [17] خوداما بەر

دەرگەهی پسیار ژ پەتروسی کر و گۆتێ: «ئەرێ تو نە ئێک ژ شاگردێت ڤی زەلامی؟» ئەوی بەرسڤ دا: «نەخێر - ئەز نە ژ وانم.» [١٨] و ژبەر سەرمایێ کویلا و نوبەدارا ئاگرەک هەلکربوو خۆ گەرم دکرن، و پەتروسی ژی خۆ دگەل وان گەرم دکر.

### حەننان ڤەکۆلینێ دگەل عیسای دکەت:

[١٩] سەرۆکێ قەشا پسیار ژ عیسا کر دەربارەی شاگردێت وی و فێرکرنا وی. [٢٠] عیسای بەرسڤ دا: «ئەز ب ئاشکرایی بۆ دونیایێ ئاخفتیم و من هەردەم ل کنیشتا و ل پەرستگەهێ جهێ کۆمبوونێت جوهییا فێرکرن دکر و من چو تشت ب دزیڤە نەدگۆت. [٢١] ڤێجا تو بۆچی پسیارێ ژ من دکەی؟ پسیارێ ژ وان بکە ئەوێت ئەو ئاخفتنا من بۆ وان گۆتی گوهـ لێ بوویی، ئەو دزانن کا من چ گۆتییە.» [٢٢] دەمێ عیسای ئەڤە گۆتی ئێک ژ نوبەدارا زللەهەک لێ دا و گۆت: «ما دێ ب ڤی رەنگی بەرسڤا سەرۆکێ قەشا دەی؟» [٢٣] عیسا بەرسڤا وی دا: «هەکەر من ئاخفتنەکا خەلەت گۆتبیت، ل سەر من دیار کە، بەلێ هەکەر ئاخفتنا من یا راست بیت، تو بۆچی ل من ددەی؟» [٢٤] ڤێجا حەننانی گرێدای هنارتە نک قیافای سەرۆکێ قەشا.

**پەتروس دیسان خۆ ل عیسای ناکەتە ناس:**

(٢٥) و هێشتا پەتروس ل وێرێ بێ راوەستای بوو خۆ گەرم دکر. پسیار ژ وی هاتە کرن: «ئەرێ ما تو ژی نە ئێکی ژ شاگردێت وی؟» ئەوی حاشا کر و گۆت: «ئەز نە ئەوم.» (٢٦) ئێک ژ کویلێت سەرۆکێ قەشا گۆت، ئەو ژی خزمێ وی کویلەی بوو ئەوێ پەتروسی گوهێ وی بری: «ما من تو ل گەل وی نەدیتی ل ناڤ چەمی؟» (٢٧) پەتروسی جارەکا دی حاشا کر، و د گاڤێدا دیکلی بانگ دا.

**پیلاتس ڤەکۆلینێ دگەل عیسای دکەت:**

(٢٨) و هێشتا تاری گەورک، عیسا ژ مالا قیافای برنە مالا خوندکارێ رۆمانی. جوهی نەچۆنە د مالا خوندکاریڤە داکو حەرام نەبن و بشێن ژ کاڤرێ جەژنا دەربازبوونێ بخۆن. (٢٩) ڤێجا پیلاتس دەرکەفتە نک وان و پسیار ژ وان کر: «هوین ڤی زەلامی ب چ تشتی گونەهبار دکەن؟» (٣٠) وان بەرسڤا وی دا: «هەکەر گونەهبار نەبا، مە نە دئینا نک تە.» (٣١) پیلاتسی گۆت: «هوین ببەن و ل دویڤ دەستورێ خۆ وی داد بکەن.» وان بەرسڤا وی دا:

«مە چو ماف نینە ئەم کەسێ بکوژین.» [٣٢] و ئەڤە چێبوو داکو ئەو پەیڤا عیسای گۆتی بۆ وێ مرنا ئەوا دێ پێ مرت ب جھ بێت. [٣٣] پیلاتس دیسان چۆ د ژۆرڤە و گازی عیسای کر و پسیار ژێ کر: «ئەرێ تو پاشایێ جوهییایی؟» [٣٤] عیسای بەرسڤ دا: «تو ڤی تشتی ژ نک خۆ دبێژی یان هندەکێت دی دەربارەی من گۆتینە تە؟» [٣٥] پیلاتسی گۆت: «ما ئەز جوهیمە؟ مللەتێ تە و سەرۆکێت قەشا تو یێ دایە دەستێ من. تە چ کرییە؟» [٣٦] عیسای بەرسڤ دا: «پاشاتییا من نە ژ ڤێ دونیاییێیە. هەکەر پاشاتییا من ژ ڤێ دونیایێ با، دا زێرەڤانێت من شەری کەن داکو ب دەستێ جوهییا نەئێمە گرتن. بەلێ نۆکە پاشاتییا من نە ژ ڤێرێیە.» [٣٧] پیلاتسی گۆتێ: «یا تو پاشای!» عیسای بەرسڤا وی دا: «تە ب خۆ گۆتی ئەز پاشامە. ژبەر هندێ ئەزێ ژ دایک بوویم و هاتیمە دونیایێ داکو شەهدەکییێ بۆ راستیێ بدەم. هەر کەسێ ژ راستیێ بت دێ گوهێ خۆ دەتە دەنگێ من.» [٣٨] پیلاتسی گۆتە وی: «راستی چی یە؟» پاشی چۆ دەڤ جوهییا و گۆت: «ئەز چو گونەها ل وی نابینم. [٣٩] بەلێ د رەوشتێت هەوەدا یا چێبووی هەر سال ئێک ژ زیندانکرییا ل جەژنا دەربازبوونێ بۆ هەوە بەردەم. ڤێجا هەوە دڤێت پاشایێ جوهییا بۆ هەوە

بەردەم؟» [٤٠] هەمییا کرە هەوار و گۆتن: «ئەوی بەر نەدە، بەلێ باراباسی بەردە.» هەر چەند باراباس دز و رێگر بوو.

# پشکا نوزدێ (١٩)

## دادکرنا عیسای ب خاچدانێ:

[١] وی دەمی پیلاتسی فەرمان دا کو عیسای ببەن و قامچی دەن. [٢] و سەربازا ستری ڤەهاندن و کرنە تانج و دانانە سەر سەرێ وی، و کورکەکێ ئەرجوانی کرنە بەر [٣] و چۆنە دەڤ وی و گۆتنێ: «سلاڤ، ئەی پاشایێ جوهییا!» و زللەھ دانانێ. [٤] و جارەکا دی پیلاتس بۆ جەماوەری دەرکەفت و گۆتە وان: «ئەز دێ بۆ هەوە ئینمە ژ دەرڤە دا بزانن کو یەک گونەهێ ل نک وی نابینم.» [٥] و عیسا دەرکەفت و تانجا ستری ل سەر سەرێ وی بوو و کورکێ ئەرجوانی ل بەر بوو. پیلاتسی گۆتە وان: «ئەها ئەڤەیە مرۆڤ!» [٦] دەمێ سەرۆکێت قەشا و زێرەڤانا ئەو دیتی کرنە گازی: «خاچ دە! خاچ دە!» پیلاتسی گۆتە وان: «هوین ببەن و خاچ دەن چونکو ئەز چو گونەها وی نابینم.» [٧] جوهییا بەرسڤا وی دا: «مە دەستوورەکێ هەی و ل دویڤ دەستورێ مە دڤێت ئەو بمریت چونکو وی یا خۆ کرییە کورێ خودێ.» [٨] دەمێ پیلاتسی ئەڤ ئاخفتنە گوه

لێ بووی، ترسا وی مەزنتر لێ هات[٩] و دیسان چۆ د ژۆرڤە و پسیار ژ عیسای کر: «تو ژ کیڤە هاتی‌یە؟» عیسای بەرسڤا وی نەدا.[١٠] ڤێجا پیلاتسی گۆتێ: «ئەرێ تو ل گەل من نائاخڤی؟ ئەرێ ما تو نزانی من دەستهەلاتداری‌یا هەی ئەز تە ئازاد کەم و دەستهەلاتداری‌یا هەی ئەز تە خاچ دەم؟»[١١] عیسای بەرسڤا وی دا: «تە ژبنی دەستهەلاتداری ل سەر من نە بوویە هەکەر ژ ئەسمانا بۆ تە نەهاتبتە دان. ژبەر هندێ ئەوێ ئەز دایمە دەستێ تە گونەها وی مەزنترە.»[١٢] و ژ هنگێ وەرە پیلاتسی بزاڤ دکر کو وی ئازاد کەت، بەلێ جوهیا کرە گازی و گۆتن: «هەکەر تە ئەڤە ئازاد کر، تو نە ژ هەڤالێت قەیسەری‌یی. هەر کەسێ خۆ بکەتە پاشا دێ دژی قەیسەری بیت.»[١٣] دەمێ پیلاتسی گوه ل ڤێ ئاخفتنێ بووی، عیسا ئینا دەرڤە و ل سەر کورسیکا دادپەروەریێ روینشتە خوار ل جهەکی دگۆتنێ بەلات و ب جوهیانی دگۆتێ جەباثا.[١٤] و دەمژمێر شەش ژ رۆژێ بوو ل رۆژا ئامادەکرنا شیڤا دەربازبوونێ. و پیلاتسی گۆتە جوهیا: «ئەڤەیە پاشایێ هەوە!»[١٥] وان کرە گازی: «ببە! ببە! ل خاچێ بدە!» پیلاتسی پسیار ژ وان کر: «پاشایێ هەوە ل خاچێ بدەم؟» سەرۆکێت قەشا بەرسڤا وی دا:

«ژبلی قەیسەری مە چو پاشا نینن.» [١٦] ڤێجا پیلاتسی ئەو دا دەستێ وان دا بێتە خاچدان و عیسا برن.

**ل خاچدانا عیسای:**

[١٧] عیسا دەرکەفت و خاچا خۆ هەلگرت و چۆ جهەکێ دبێژنێ کلوخ و ب جوهییانی دگۆتنێ جەلجەثە. [١٨] و ل وێرێ ئەو خاچ دان و دگەل وی دوو زەلامێت دی ژی ل خاچێ دان، هەر ئێک ل رەخەکێ وی و عیسا د نیڤەکێدا.
[١٩] پیلاتسی پارچەکا داری هنداف سەرێ وی هەلاویست و ل سەر یا نڤێسی بوو: «عیسایێ ناسری پاشایێ جوهییا.» [٢٠] گەلەک ژ جوهییا ئەو پارچا داری خاند، چونکو ئەو جهێ عیسا لێ خاچ دای یێ نێزیکی باژێری بوو، و ئەو پارچا داری ب جوهییانی و لاتینی و یونانی نڤێسی بوو. [٢١] سەرۆکێت قەشێت جوهییا گۆتنە پیلاتسی: «نە نڤێسە: «پاشایێ جوهییا» بەلێ بنڤێسە: «ڤی مرۆڤی یێ گۆتی ئەز پاشایێ جوهییامە.»»
[٢٢] پیلاتسی بەرسڤا وان دا: «یا من نڤێسی من یا نڤێسی!»
[٢٣] دەمێ سەربازا عیسا ل خاچێ دای جلکێت وی برن و کرنە چار پارچە و هەر سەربازەکی پارچەک بر و کراسێ وی ژی برن، و هەمی ئێک پارچە بوو، بێ دوریار بوو.

[٢٤] سەربازا گۆتە ئێکودوو: «پێتڤی نینە پارچە پارچە کەین بەلێ دا بهاڤێژینە پشکێ کا دێ بۆ کێ کەڤت.» ئەڤ چەندە روی دا دا ئەوا د پەرتوکێدا هاتی بێتە جھ: **کراسێ من دناڤ بەرا خۆدا دابەش کرن، و کراسێ من هاڤێتنە پشکێ.**[زەبور ٢٢:١٨] و ئەڤە بوو ئەوا سەربازا کری.

[٢٥] ل نێزیکی خاچا عیسای، مەریەما دایکا وی یا راوەستای بوو و خالەتا وی و مەریەما ژنا گلوپا و مەریەما مەجدەلی. [٢٦] دەمێ عیسای دایکا خۆ دیتی، و ئەو شاگردێ گەلەک دڤیا یێ نێزیکی وێ راوەستیای بوو، گۆتە دایکا خۆ: «دایکێ، ئەڤەیە کورێ تە!» [٢٧] پاشی گۆتە شاگردی: «ئەڤە دایکا تەیە!» و هەر ژ وی دەمی وەرە شاگردی مەریەم برە دەڤ خۆ.

**مرنا عیسای:**

[٢٨] پشتی ڤێ چەندێ عیسای دیت کو هەمی تشت تەمام بوو، ڤێجا دا پەرتوک تەمام بیت گۆت: «ئەز یێ تێهنیمە.» [٢٩] و جەرەکێ پڕی سهک یێ ل وێرێ بوو. ڤێجا ئیسفەنجەک د سهکێ هەلاندن و دانانە سەر گیایێ زوفا و دانا سەر دەڤێ عیسای. [٣٠] دەمێ عیسای تام کرییە سهکێ گۆت: «تەمام بوو!» و سەرێ خۆ چەماند و روح سپارت.

[٣١] ل دەمێ ئامادەکرنێ، داکو تەرم ل سەر خاچێ نەمیننە رۆژا شەمبیێ کو رۆژەکا مەزن بوو، جوهیيا ژ پیلاتسی داخواز کر کو پێت وان ئەوێت خاچ داین بشکینن و تەرمێت وان راکەن. [٣٢] ڤێجا سەرباز هاتن و پێت وان هەر دوو زەلاما شکاندن ئەوێت ل خاچێ داین دگەل عیسای. [٣٣] بەلێ دەمێ گەهشتینە عیسای دیتن بیێ مری، ڤێجا پێت وی نەشکاندن. [٣٤] بەلێ ئێک ژ وان سەربازا رمەک ل تەنشتا وی دا و د گاڤێدا خوین و ئاڤ دەرکەفتن. [٣٥] ئەوێ ئەڤە دیتی ئەو شەهدەکیێ ددەت و شەهدەکییا وی دروستە و یێ دزانیت ب تەمامی ئەو یێ راستییێ دبێژیت داکو هوین ژی باوەرییێ بینن. [٣٦] ئەڤێ چەندێ روی دا دا ئەوا د پەرتوکێدا هاتی ب جه بێت: **چو هەستی ژ وی نائێنە شکاندن.** [دەرکەفتن ١٢:٤٦ زەبور ٣٤:٢٠] [٣٧] و هەروەسا د جهەکێ دیدا د پەرتوکێ یا هاتی: **دێ بەرێ خۆ دەنە وی ئەوێ وان رم لێ دای.** [زەکەریا ١٢:١٠]

**ڤەشارتنا تەرمێ عیسای:**

[٣٨] پشتی هینگێ یوسڤی ئەوێ خەلکێ رامە داخواز ژ پیلاتسی کر کو بهێلیت ئەو تەرمێ عیسای ببەت. ئەڤ یوسڤە شاگردێ عیسای بوو، بەلێ ب نهێنی چونکو ئەو ژ جوهییا دترسیا. و پیلاتسی دەلیڤە دایێ و تەرمێ عیسای

بر. [٣٩] نیـقـودیموس، ئەڤێ بەری نۆکـە ب شـەڤێ هاتییە دەڤ عـیسای، ئەو ژی هات و نێزیکی سەد منێت (ئانکو سیە لیترێت) مرێ تێکەل دگەل عودێ دگەل خۆ ئینان. [٤٠] تەرمێ عـیسـای برن و کفن کـر دگەل بێـهنێت خۆش، هەروەکو رەوشتێت جوهیـیا دەمێ مرییێت خۆ ڤەدشارتن. [٤١] و باغـەک هەبوو ل وی جـهی ئەوێ عـیـسـا لێ خـاچ داین، گـۆڕەکێ نوی دناڤ وی باغیدا هەبوو و کـەس بەری وی تێدا نەهاتبـوو ڤەشارتن، [٤٢] و عـیسـا د وی گـۆڕیدا ڤـەشـارتن چونکو نێـزیک بوو و چونکو ئەو رۆژە رۆژا ئامادەکرنێ بوو ل دەڤ جوهییا.

## پشکا بیستێ (٢٠)

### گۆڕێ ڤالا:

[١] و ل رۆژا ئێکێ ژ حـەفـتـییێ مـەریەمـا مـەجـدەلی سـپێـدێ زوی رابوو و چۆ سەر گـۆڕێ عـیسـای و هێـشـتـا تاری بوو، و بەرێ خۆ دایێ بەر یێ ژ سەر دەرگەهێ گـۆڕی هاتییە لادان. [٢] ئینا ب لەز چۆ دەڤ شـەمـعـون پەتروسی و شـاگـردێ دی ئەوێ عـیـسـای حـەژێ دکـر و گـۆتە وان: «خـودان ژناڤ گـۆڕی برن و ئەم نزانین کـیـڤـە برنە.» [٣] ئینا پەتروس و شـاگـردێ دی دەرکـەفتن و چۆنە سـەر

گـۆڕی. [٤] و هەردووکـا ل گـەل ئێک دکـرنە غـار، بەلێ شـاگـردێ دی بەراهیيا پەتروسی راکـر و ژ بەری وی گەهشتە سەر گۆڕی. [٥] خۆ چەماند و دیت کفنێ ل سەر ئەردیيە، بەلێ نە چۆ ژۆر. [٦] پاشی شەمعون پەتروسی د دویڤدا گەهشتە گۆڕی و چۆ ژۆر و ئەوی ژی دیت کفن ل سەر ئەردی د دانایینە [٧] و ئەو دەرسۆکا ل سەر سەرێ عیسـای دیت ب تنێ پێچـایيە و ل دویری کفنیيە. [٨] هینگێ شـاگـردێ دی هاتە ژۆر ئەوێ ل بەراهیێ گەهشتیيە سەر گۆڕی. ئەو چەندە دیت و باوەری ئینا. [٩] چونکو شـاگـردا هەتا وی دەمی نەدزانین د پەرتوکێدا هاتیيە کـو دڤێت ئەو ژناڤ مـرییـا رابیت. [١٠] و پاشی هەردوو شاگرد ڤەگەڕیانە مالێت خۆ.

## مەسیح بۆ مەریەما مەجدەلی دیار دبیت:

[١١] بەلێ مەریەم ژ دەرڤە ما راوەستای و ل دەڤ گۆڕی دگری. و دەمێ ئەو دگری خۆ چەماندە گۆڕی [١٢] و چاڤێ وێ ب دوو فـریشتـا کەت جلکێت سپی ل بەر وان بوون. و ل ئەردێ تەرمێ عیسـای لێ دانای روینشتی بوون، ئێک ل دەڤ جهێ سەرێ وی و یێ دی ل دەڤ جهێ پێت وی. [١٣] ئینا ئەوان پسـیـار ژێ کـر: «ئەی ژنکێ بۆچی دگـری؟» ئەوێ بەرسڤ دا: «خـودانێ من برن و ئەز نزانم

دانانە کیڤە.» [١٤]ئەڤ چەندە گۆت و ل خۆ زڤری و عیسا دیت یێ راوەستای‌یە، بەلێ نەزانی ئەو عیسایە. [١٥]ئینا ئەوی پسیار ژێ کر: «ئەی ژنکێ، تو بۆچی دگری؟ تو ل کێ دگەرێی؟» ئەوێ هزر کر ئەو رەزڤانە، ئینا گۆتێ: «ئەز خودام، هەکەر تە برییت، بێژە من تە دانایە کیڤە دا ئەز ببەم.» [١٦]ئینا عیسای گازی کرێ: «ئەی مەریەم!» ئینا ل خۆ زڤری و ب جوهییانی گازی کر: «رەببونی!» ئانکو «ئەی مامۆستا!» [١٧]ئینا گۆتێ: «دەست نەکە من، چونکو هێشتا ئەز نە چۆمە دەڤ بابی. بەلێ هەرە دەڤ برایێت من و بێژە وان: عیسا دبێژیت: ئەز دێ چمە دەڤ بابێ خۆ و بابێ هەوە و دەڤ خودایێ خۆ و خودایێ هەوە.» [١٨]ئینا مەریەما مەجدەلی ڤەگەریا و مزگینی گەهاندە شاگردا و گۆت: «من خودان دیت!» و کا چ گۆتییێ گەهاندە وان.

### مەسیح بۆ شاگردێت خۆ دیار دبیت:

[١٩] و دەمێ ل وێ رۆژێ بوویە ئێڤار، ئەو رۆژا ئێکێ‌یە ژ حەفتییێ، و شاگرد ل مالەکێ کۆم ببوون و ژ ترسێت جوهییا دا دەرگەهـ ل خۆ گرتبوون، ژ نشکەکێ‌ڤە عیسا دناڤ بەرا واندا دیار بوو و گۆت: «ئاشتی بۆ هەوە بیت!» [٢٠]و دەمێ ئەو چەندە گۆتی دەستێت خۆ و تەنشتا خۆ

نیشا وان دان. و شاگرد دلخۆش بوون چونکو خودان دیتن. [٢١]دیسان گۆتە وان: «ئاشتی بۆ هەوە بیت! کا چاوا بابی ئەز هنارتم، ئەها وەسا ئەز هەوە دهنێرم.» [٢٢]ئەڤ چەندە گۆت و پف کرە وان و گۆتە وان: «روحا پیرۆز وەرگرن! [٢٣]هەچییێ هوین ل گونەهێت وان ببۆرن، دێ لێ ئێنە بۆرین، یێ هوین لێ نەبۆرن، ل وان نائێنە بۆرین.»

## مەسیح خۆ نیشا توماى دکەت:

[٢٤]بەلێ توما، ئێک ژ هەر دوازدە شاگردا بوو، ب ناڤێ دیدیموس ناڤدار بوو، ئەو ل گەل شاگردا نەبوو دەمێ عیسا ئامادە بووی. [٢٥]ئینا شاگردێت دی گۆتنێ: «مە خودان دیت.» بەلێ بەرسڤ دا: «هەکەر ئەز شوینا بزمارا ل دەستێت وی نەبینم و تبلا خۆ نە دانمە سەر جهێ بزمارا و دەستێ خۆ نەدانمە سەر تەنشتا وی، باوەر ناکەم.» [٢٦]و پشتی هەشت رۆژا شاگردێت وی جارەکا دی ل خانی کۆم بووین و توما ل گەل وان بوو. و عیسا هات هەر چەند دەرگەه دگرتیبوون و د نیڤێدا راوەستا و گۆت: «ئاشتی بۆ هەوە بیت!» [٢٧]و پاشی گۆتە توماى: «تبلا خۆ بینە ڤێرێ و سەح کە دەستێت من و دەستێ خۆ بینە و دانە سەر تەنشتا من، و بێ باوەر نەبە بەلێ ب باوەر بە.» [٢٨]ئینا توماى کرە گازی: «خودانێ من و خودایێ من!»

[٢٩]ئینا عیسای گۆتێ: «چونکو تە ئەز دیتم تە باوەری ئینا. خنێکا وان کەسا ئەویت نەبینن و باوەریێ بینن.»

**ئارمانجا ڤێ پەرتوکێ:**

[٣٠]و عیسای گەلەک نیشانێت دی یێت سەیر ل پێش چاڤێت شاگردێت خۆ کرن، د ڤێ پەرتوکێدا نەهاتینە نڤێسین. [٣١]بەلێ ئەڤ نیشانە هاتنە نڤێسین داکو هوین باوەریێ بینن عیسا مەسیحێ کوڕێ خودێ یە و ب رێکا باوەریێ هەوە ژیان ب ناڤێ وی هەبیت.

## پشکا بیست و ئێکێ (٢١)

**عیسا ل دەریاچا تەبەریە خۆ نیشا هندەک شاگردا دکەت:**

[١]پشتی وێ چەندێ عیسای جارەکا دی خۆ بۆ شاگردێت خۆ ل بەر لێڤا دەریاچا تەبەریە دیار کر. و وەسا خۆ دیار کر: [٢]شەمعون پەتروسی و توما یێ دگۆتنێ دیدیموس و نەتانائیل، ئەو ژ قانا ژ دەڤەرا جەلیل بوو، و هەردوو کوڕێت زەبدی و دوو شاگردێت دی کۆم بوون. [٣]ئینا شەمعون پەتروس گۆت: «ئەز دێ چمە ماسیا گرم!» گۆتن: «ئەم ژی دێ ل گەل تە ئێین.» و چۆن و ل

قاییکێ سیار بوون، بەلێ وان د وێ شەڤێدا چو ماسی نەگرتن. [٤] و دەمێ ئەلند دەرکەفتی عیسا ل سەر لێڤا ئاڤێ راوەستیا، بەلێ شاگردا نەزانین کو عیسایە. [٥] عیسای پسیار ژ وان کر: «گەلی خۆرتا، هەوە ماسی نینن؟» بەرسڤا وی دان: «نە خێر.» [٦] گۆتە وان: «تۆرێ بهاڤێژنە رەخێ راستێ یێ قاییکێ و دێ بینن!» ڤێجا هاڤێتن و نەشیان تورکێ بهەلکێشن هندی ماسی تێدا بوون. [٧] ئەو شاگردێ، عیسای گەلەک حەژێ دکر، گۆتە پەتروسی: «ئەو خودانە!» دەمێ شەمعون پەتروس گوه لێ بووی کو ئەو خودانە، کورکێ خۆ د خۆ وەرکر، چونکو یێ رویس بوو، و خۆ هاڤێتە د ئاڤێدا. [٨] و شاگردێت ماین قاییک ئینا و یێ تورکێ دکێشن، چونکو گەلەک دویر نە بوون ژ لێڤا ئاڤێ، ب تنێ دوو سەد گەزا. [٩] دەمێ چۆینە سەر لێڤا ئاڤێ، هندەک پەل دیتن و ماسییەکا ل سەر و نان ژی دیتن. [١٠] عیسای گۆتە وان: «ژ وان ماسییا بینن ئەوێت هەوە نۆکە گرتین!» [١١] شەمعون پەتروس ب سەر کەتە قاییکێ و تورک بۆ هشکیێ کێشا، سەد و پێنجی و سێ ماسییێت مەزن تێدا بوون و ل گەل ڤێ گرانیێ تورک نەدریا. [١٢] عیسای گۆتە شاگردا: «وەرن بخۆن» و کەس ژ شاگردا نەویریا پسیارێ ژێ بکەت: «کا تو کی؟» چونکو وان زانی کو ئەو خودانە. [١٣] ئینا عیسا پێشڤە چۆ و

نان هەلگرت و دا وان و هەروەسا ماسی. [١٤] ئەڤە جارا سێیە عیسا خۆ بۆ شاگردێت خۆ دیار دکەت پشتی ژناڤ مرییا رابووی.

## مەسیح ل گەل پەتروسی دئاخڤیت:

[١٥] و پشتی خوارین عیسای پسیار ژ شەمعون پەتروسی کر: «ئەی شەمعونێ کورێ یوحەننای تو ژ ڤان پتر حەژ من دکەی؟» بەرسڤا وی دا: «بەلێ خودان، تو دزانی تو خۆشتڤیی ل دەڤ من.» گۆتە وی: «خوارنێ بدە بەرخێت من.» [١٦] جارەکا دی پسیار ژێ کر: «ئەی شەمعونێ کورێ یوحەننای، تو حەژ من دکەی؟» بەرسڤا وی دا: «بەلێ خودان، تو دزانی تو خۆشتڤیی ل دەڤ من.» گۆتێ: «چاڤدێرییا بەرخێت من بکە.» [١٧] جارەکا دی پسیار ژێ کر: «ئەی شەمعونێ کورێ یوحەننای ئەزێ خۆشتڤیمە ل دەڤ تە؟» پەتروس پوسیدە بوو چونکو جارا سێێ گۆتێ «ئەزێ خۆشتڤیمە ل دەڤ تە؟» و گۆتێ: «ئەی خودان، تو هەمی تشتا دزانی، تو دزانی تو ل دەڤ من خۆشتڤیی.» عیسای گۆتێ: «خوارنێ بدە بەرخێت من. [١٨] ب راستی ئەز دبێژمە تە، دەمێ تو یێ گەنج تە شویتکا خۆ ل ناڤتەنگا خۆ گرێددا و هەر جهێ تە دڤیا تو دچۆیێ، بەلێ دەمێ تو پیر دبی دێ دەستێت خۆ

درێژ کەی و ئێک دێ شویتکا تە گرێدەت و دێ تە بەتە وی جهی یێ تە نەڤێت بچیێ.» [١٩] عیسای ئەڤ چەندە گۆت و بەحسا وێ مرنێ کر ئەوا کو پەتروس دێ پێ مریت و خودێ پێ مەزن کەت. دەمێ ئەو چەندە گۆتییێ، گۆتێ: «ل دویڤ من وەرە!»

[٢٠] پەتروسی سەح کرە پشت خۆ، دیت ئەو شاگردێ عیسای حەژێ دکر یێ ل دویڤ وان دچیت، ئەو شاگردە ئەوێ ل سەر شیڤێ خۆ نێزیکی عیسای کری و گۆتییێ: «ئەی خودان ئەو کی یە دێ بێبەختییێ ل تە کەت؟» [٢١] ڤێجا دەمێ پەتروسی دیتی پسیار ژ عیسای کر: «ئەی خودان، دەربارەی وی دێ چاوا بیت؟» [٢٢] عیسای بەرسڤا وی دا: «هەکەر من ڤیا کو ئەو بمینیتە ساخ هەتا ئەز ڤەگەڕیێم، ما تە چ هەق پێ یە؟ تو ل دویڤ من وەرە!» [٢٣] ڤێجا دەنگ و باسەک بەلاڤە بوو دناڤ برادا کو ئەو شاگردە نامریت. بەلێ عیسای نەگۆتبوو پەتروسی: «ئەو نامریت» ، بەلێ گۆت: «هەکەر من ڤیا بمینیتە ساخ هەتا ئەز ڤەگەڕیێم، ما تە چ هەق پێ یە؟»

[٢٤] ئەڤ شاگردە شەهدەکیێ ل سەر ڤان تشتا ددەت و ل ڤێرێ بێت نڤێسین، و ئەم دزانین کو شەهدەکییا وی راستە.

[٢٥] و گەلەک تشتێت دی عیسای بێت کرین و ئەز یێ

ل وێ باوەرێ هەکەر هەمی ئێک ئێکە هاتبان نڤێسین، دونیا هەمی تێرا وان پەرتوکا نەدکر ئەوێت هاتینە نڤێسین.